پێشکەشە بە:

هاورێم:

شاعیری جوانەمەرگ

مارف ئاغایی

# سەرنج

ئەم چەند وتارە جیا جیایە، کە لەسەردەمی جیاجیاشدا نوسراون، سەرومڕ ئەچنە ناو ئەو بازنە، یان ئەو خانەیەوە، کە لەزانستی ئەدەبدا، پێیان ئەوترێ: رەخنە، یانٍ لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی. پێم خۆش بو لە گەڵ چەندان نوسینی تری پەرت و بلاوی لەم جۆرەدا، کە لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی سەردەمی ژیانی شارو شاخم دا، لە دوو توێی رۆژنامەی ژین و هاوکاریو بەیان و رۆشنبیری نوێ و سروەو، دواتریش لەسەر لاپەڕە ئازادەکانی گۆڤاری نوسەری کوردستان و سروەو گەلاوێژی نوێ و ئێستاو رامان و ئاوێنەو، هەندێ گۆڤاری کوردی ئەورپا، بلاّوکراونەتەوە، بیانکەمە کتێبێك.

بەلاّم لەم دەرفەتەدا، جارێ هەر ئەوەندەیانم کەوتنە چنگ و دەستم بە کۆکردنەوەی هەموویاندا نەگەیشت. بە تایبەتی بەو نوسینانەمدا، کە لە ژمارە بەرودواکانی نوسەری کوردستان دا بلاّوکراونەتەوە.

وەك وتیشم چونکە ئەم وتارانە، بە هەمویان ئەچنە بازنەی رەخنەوەو رەخنەش، پشکنین و دیتنەوەو قۆستنەوەی ئەو تروسکەو روناکیو گزنگە شاراوانەی، ناو دوو توێی بەرهەمێکە. بۆیە، لەگیانی دیتن و چنینەوەی هی ئەو تروسکەو گزنگە شاراوانە.

نــــاوم نا: راوە گزنگ

محەمەد حەمە باقی

سەقز

١٩٩٨/٣/٣ی زایین

## هەڵەبجە
## ئەدەب و هونەرو سیاسەت.

دەمێکە بیروبۆچوونێکی سیاسی هەیە، ئەڵێ هەموو شتێك: سروشت، مادە، مرۆڤ، هونەر، ئەدەب...هتد، بىن بە پاشکۆی سیاسەت و لە راژەی هەڵس وکەوتی سیاسەتی رۆژانەو تاکتیکی رۆژانەدا بئامرازێندرێن!!.

پێچەوانەی ئەم بیروبۆچوونەش، لەگەڵ بیروبۆچونی ئەو رایەی سەرەوە، هێشتا لە مشتومڕدان، کە ئەڵێ: ئەدەب و هونەرو هەموو داهێنانێکی فیکریی مرۆڤ، لە سیاسەت رووت بکرێتەوە.

بۆ کلۆڵیی، ئێمەی دانیشتووی ئەم پارچەیەی خۆرهەلاتی ناوەڕاست، کەوتینە بەر شەپۆل و ژێر زەبری ئەو بۆچوونە وشك و..ببورن، ئەگەر زات بکەم و، بوێرم و بڵێم - مۆامرە (پیلان)ەوە)، کە ئەڵێ ئەبێ هونەرو ئەدەب، پاشکۆو بەچکەی سیاسەت بن!!.

ئیتر ئەم پاشکۆیەتیو بەچکایەتیەی ئەدەب و هونەر، کارێکی وایکرد، هەرچی شوێن تەفرەی ئەم دان و داوە بکەوێو لەسەر بەرنامەکەی، بەرهەمی هونەرییو ئەدەبیی بۆ دروست بکەن، بە سەدان و هەزاران لەمجۆرە بەرهەمە، هەر لە دوای بەسەرچوونی باوی ئەو موناسەباتانەی ئەدەب و هونەرەکەیان بۆ کراوە بە ئامێر، هێزو پێزو وزەو توانای ژیانیان تیا کز بێو وەکو تەم و وەکو مردوو، بڕەوێنەوەو لەبیر بچنەوە. بە واتەیەکی تر، کارە هونەرییو ئەدەبیەکە، پاش ماوەیەکی مێژوویی، ببنە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، نەك بەڵگەنامەیەکی هونەریو ئەدەبی. چونکە هەر لە سەرەتای لە دایکبوونیانەوە، ئەوەندە بە زەقیی ئەرکی سیاسەت: ئایدۆلۆژیا - یان لە ئەستۆ ئەگیرێ، ئەبن بەژێر باری گرانی ئایدۆلۆژیاوە.!

ئەم بیروبۆچوونە، وەك وتم، لەدێر زەمانەوە لە ئارادا بوو. بەلام ئاشکراترو

زەقتر، لە سەر دەم و تا لەسەر دەستی ژدانۆف دا هاندراو زەمینەی بۆ خۆشکراو لێکۆڵەرەوانیشی بۆ سازدرا تا زاراوەو پێناسەی رەخنەیی بۆ بدۆزنەوەو ئەنجامیش بڵێن:

هونەرو ئەدەب لە سیاسەت جیا ناکرێنەوە!!

من لەم چەند وشەیەدا، لەبەراوردپێکردنی ئەو دوو بیروبۆچوونەی سەرەوەدا، نامەوێ بڵێم: هونەرو ئەدەب، کاریان بەسەر سیاسەتەوە نیە. بە پێچەوانەوە بەڵکو پێم وایە:

ئەدەب و هونەر، خۆیان سیاسەتن! بەڵام چۆن؟

لەوەلاّمدا ئەڵێم: ئەگەر کۆڵەگەکانی پێکهاتنی ژیانی مرۆڤ، چەند شتێك بن، کە یەکێکیان سیاسەتە، ئەوا ئەدەب و هونەریش دوو کۆڵەکەی تری پێویستی ژیانی مرۆڤن. وەك نمونەی ئەو پارچە مۆسیقایەی کە بە چەند ئامێرێکی جیا جیا، سەرتاپای ئاوازێك پێکدێنن، کە هەر پارچەیەی، جۆرە ئەرکێك و جۆرە ئاوازێکی هەیەو هیچ کام لەو ئەرك و دەنگانەش لە یەك ناچن و هیچیشیان کاری ئەوی تریان ئەنجام نادەن؛ بەلاّم لە ئاکامدا بە هەموویان، ئەرکێکی گەورەترو هاریکاری پێکدێنن، کە ئەرکی سازدانی پارچە مۆسیقاکەیە.

هونەرو ئەدەب و سیاسەتیش، هەر یەکەیان بە جیا جیاو تەنیا، سەربەخۆیی‌و تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەلاّم هەسێکیشیان پێکەوە ئەرکی بەختەوەریی مرۆڤ ئەنجام ئەدەن؛ ئەگەر ئەو ئەرکەش ئەنجام نەدەن، نەبوونیان باشترە.

بەلاّم لێرەدا، لە تێکەڵکردنی باسی هونەرو ئەدەب و سیاسەت دا، دوو حاڵەتی سیاسی جیا ئەکەمەوە: یەکەمیان ئەو حاڵەتەی کە رووداوێکی سیاسی، ئەبێتە هەوێن و سەرچاوەی گینگڵ و ژانێکی قووڵ و رەسەن و کاریگەرو سروشتی، بۆ داهێنانەکە، وەك نمونەی نزیك و زیندووی ئەو قەسیدە مەزنەی کە نالی لەشامەوە، بۆ سالم ی شاعیرو هاوڕێی ناردوو؛ یان ئەو قەسیدەیەی کە شوکری فەزڵی لەسەردەمی دەسەلاّتدارێتی شێخ مەحمودی نەمردا بۆ شێخی نووسیوەو ئەم بەیتە سەرەتاکەیەتی:

ئیش کەرووی ئێستە لە هەورازە، سەرەو لێژی نەکەی
فیکری وردیشی ئەوێ، هەربەدوعاو نوێژی نەکەی

یان ئەم قەسیدە جوانەی کە هەر لەسەردەمی دەسەلاّتدارێتی شێخی نەمردا،

پیرەمێرد - ی شاعیر بۆی نووسیوە:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا ، لە ئاستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی سەرفرۆ دێنێ لەبۆ پیاڵە، کە تێکا، بۆی

لەگەڵ دەیان و سەدان نمونەیتری لەم بابەتە.

دووەمیشیان، ئەو حاڵەتەی کە دیسان هەر رووداوێکی سیاسی، بەلاّم راگوزاریو تەنك، بەرهەمێك ئەخاتەوە، وەك نمونەی زۆر شیعری حاجی قادری کۆیی‌و، قانع و، زۆر شیعری هێمن - ی پێش سەفەری کوردستانی باشوورو زۆربەی شیعری سیاسی گۆران؛ کە جیاوازی هەردوو حاڵەتەکەش، هەر لای گۆران خۆی. ئەو جۆرە شیعرانەن کە سیاسەتیشن، بەلاّم هونەرن، وەك: دوا سەرنج و زیندانی ئەژدەها، دەروێش عەبدوللاّو..هتد.

جیاوازی نێوان ئەم دوو حاڵەتە، لە یەکەمیاندا، لەدایکبوونی بەرهەم، ئێجگار رەسەنەو لە وەرزی خۆیدا و بێ زۆر لەخۆکردن. وەك: چرۆکردنی درەخت و گوڵ و منداڵبونی نۆ مانگ و نۆ رۆژەو دووەمیشیان بە زۆر چرۆپێکردنی درەخت و گوڵە، لەناوەختی خۆیاندا. کە ئاکامی هەردوو حاڵەتەکە، وەك جیاوازیی گوڵی سروشتی‌و گوڵی نایلۆن وایە. هەردوو جۆرە گوڵەکەش، بەرەنگ لەیەك ئەچن، بەلاّم یەکەمیان: تهێنی ژیان و بۆن و بەرامەی خۆرسك و سروشتیی پێیەو دووەمیشیان: مردووەو بێ‌بۆن و بەرامەیە. یەکەمیان دوای رەگ و ریشەداکوتان و قووڵبوونەوەو پێگەیشتن و پییشان، ئەوسا دێتە دنیاوەو دێتە ژیان و دووەمیشیان: وەك راپەراندن وبەئەنجام گەیاندنی کارێکی رۆژانە، دێتە دنیاوە.

لایەنگرانی حاڵەتی دووەم، لەکاتێکا کە زاراوەو پێناسەیان بۆ ئەرك و روخسارو ناوەرۆکی ئەمجۆرە داهێنانە، داناوە، مانای وایە پێشەکی کلێشەو بەرنامەی ئەمجۆرە داهێنانە رێژراوەو ئامانجە دوورو نزیکەکانیشی، بۆ دەستنیشانکراوە. کەچی ئەوەی داهێنانی مەزنی هونەرو ئەدەب، خەونی پێوە ئەبینێ، پێچەوانەی ئەمەیەو کاری هونەرو ئەدەب، پێویستیان بە ئاسۆیەکی بێ‌سنورو بەربلاّوی خەیاڵ هەیە، کەتا باڵە تیژەکانی خەیاڵ و هەست، حەز بکەن، هەر بەرین و بەرینتر بێت و تاقیکردنەوەشیان بۆ پشکنین و دۆزینەوەی جوانییە شاراوەکانی داهێنان، هەمیشەو هەمیشە، لەکۆچکردنی بێ سەروشوێن ئەچێ‌و دوژمنی رەنگ رشتن و خۆلەقاڵب دانن، لەچوارچێوەیەکی پێشتر بۆ دروستکراوو دەستنیشانکراودا.

ئەگەر بە گوێرەی ئەم بەرنامەیەو زاراوەیەش بێ، کە لایەنگرانی حاڵـەتی دووەم، بۆ فرمانی ئەدەب و هونـەر - یـان دانـاوە؛ ئیـتر ئـەبێ تاقیکردنـەوەی ئـەدەب و هونەر، لە ئاستێکدا بوەسـتێو قوتابخانـەی هونـەریو ئـەدەبی تـازەترو تەقـەللای تازەترو مێژووی تـازەترو ژیـانی تـازەتریش دروسـت نـەبن و هـەموو شـتێك لـەو چوارچێوەیەدا کۆتایی بێت، کە ئەو جۆرە بەرنامە سیاسیە، دیاری کردووە.

پرپیشکی ئەم شەپۆلە، جارجـارەش بەرهونـەرو ئـەدەبی ئێمـەش کـەوتووە، وەك ئەوەی لە سەرەتای حەفتاکاندا، ئەیویست بە پـیر پێداویسـتیەکانی ژیـانی تـازەوە بچێ، هەندێ تازە خوێندەوار، لەبەرگی پێشـکەوتنخوازیدا!! ئەیانویسـت تەگـەرەو گیروگرفت و کلێشە لە بەردەم ئەو گۆرانکاریو تازەگەرییـەدا دابنێـن، کـە ژیـانی تـازەی کۆمەڵەکـەمان داوای ئـەکرد.! بـەڵام ئـاخۆ یاسـای ژیـان، بـەم کۆسـپ و بیروبۆچوونە راوەستاو رازی بوو؟! یان ئاخۆ هونەرو ئەدەب - یش بەمە رازی ئەبن، کە هەردووکیان رەنگدانەوەی ژیانن!؟.

پێش ئەوەی هیچیـان وەڵام بدەنـەوە، ئـەڵێم: مـادام خـاوەن چێـژو هەسـتێکی هونەرییو ئەدەبی، ئەتوانێ کارێکی هونەری بەرز، لە کارێکی هونـەرییو ئـەدەبی نزم، جیا بکاتەوە، هەر بەو جۆرەش ئەڵێین: ئەی چۆن ناتوانرێ دەقێکـی ئـەدەبیی، لە دەقێکی سیاسی جیا بکرێتەوە؟!. یان دەقێکی هونەریی، لـە دەقێکـی سیاسـی جیا بکرێتەوە؟!. هەر بەو جۆرەش، ئەی چۆن ناتوانرێ کارێکیهونەریو ئەدەبی، لە کارێکی سیاسی جیا بکرێتەوە؟!.یان چۆن ناتوانرێ هونەرو ئەدەب، لـە سیاسـەت، جیا بکرێتەوە؟!. جگە لەوەی ئەبێ ئەوەمان لە یاد بێ کە ژیـان، سـەرومڕ بریتـی نیيە لە تەنیا سیاسەت!. ئەگەریش وا نییە، ئەی بۆ مرۆڤ زۆرجار، حـەز ئـەکات گوێ لە پارچە مۆسیقایەکی هێمن بگرێت؟!. لە کـاتێکدا پارچـە مۆسـیقاکە، بـە هیچ جۆرێکیش باسی سیاسەت ناکات! یان بـۆ مـرۆڤ هـەندێجار حـەز ئـەکات گوێی لە دەنگی بولبول و قاسپەی کەوو خوڕەی ئاو بێت!؟. لەکاتێکا هیچ کام لـەو دەنگانە، باسی سیاسەت ناکەن! بگرە لێشیان ناگەین.

سیاسەتمەدارێکی هۆشمەندی وەك لینین: لە کاتێکائەبوایـە حـەزی لـە مۆسـیقای مارش و شیعری مایاکۆفسکی - ی شاعیری شۆرش و سۆسیالیسـتی ئـەو کاتـەی شۆرەوی بوایە، کەچی حەزی لە بیسـتنی سیمفۆنیای بتـهۆڤن و شـیعری پۆشـکین ئەکرد!.

کەواتە باوی بانگەشەی ئەو بیروبۆچوونەی ئەدەب و هونەری وشك ئەکردەوە، زۆر دەمێکە بەسەر چووە، کە ئەیوت: جیاکردنەوەی هونەرو ئەدەب، لە باوەش و لە پاشکۆیەتی سیاسەت و دانانیان لە شوێنی تایبەتمەندی خۆیاندا، مەبەست دوورخستنەوەیانە لە پەیامی خزمەتی مرۆڤایەتیو گۆشەگیرکردنیانە، لە دنیای داخراوی: هونەر، بۆ هونەرو، ئەدەب بۆ ئەدەب دا.

بە پێچەوانەوە، کۆت و بەند پچڕاندنی سیاسەتیان، مانای تێکەڵ بوونیانە لە کاروانی ژیانی هەمیشە نەوەستاودا. کە وەستان و سەقامگیربوون و خۆ لە کلێشەو لە قالبدان، نازانن و هەمیشەو هەمیشە ئەبزوون و دڵەڕاوکەی زۆرانی بەردەوامیی مەرگ و ژیان و جوانترکردنی ژیان، لەناخی خۆیاندا، هەڵئەگرن و کۆڵنادەن.

* * *

ئەو رازەی سەرەوە، ئەکەم بە دەروازەو پیایدا ئەچمە ناو ئەو پیشانگایەوە، کە هونەرمەندان: رێبوار سەعید، ئاکۆ غەریب، عوسمان قادرو کۆمەڵێك منالانی شاری هەڵەبجەی زام و قوربانی سەردەم، لە رۆژانی ٤/١٥ تا ٩٨٩/٤/٢٢، لەشاری سەقزی شیریندا کردیانەوە.

لەبەر ئەوەی پیشانگاکەم بەلاوە زیندوو بوو، بۆیە هەر حەوت رۆژی پیشانگاکە، رۆژانە، سەردانم ئەکردو...سەردان، دوای سەردان، شتی تازەی ئەدامیو هەموو رۆژێکیش هەستی دوای دیتنەکانم، لە دەفتەری سەرنجەکانی پیشانگاکەدا ئەنووسی، تا دواتر منیش و هونەرمەندەکانیش، بە چاکمان زانی بۆ تێکەڵکردنی ئەو رازەی سەرەوەو لە هەمان کاتیشدا بۆ نرخاندنی پیشانگاکەن و بۆ ئەو سەرنجانەم، کە لە دەفتەری پیشانگاکەدا نووسیومن، وەکو خۆی، بە کەمێك دەسکاریەوە، بگوێزمەوە بۆ ئێرەش، کە ئەتوانین تێکڕای سەرنجەکان ناو بنێین:

چۆن سەیری پیشانگەیەکی هونەریی،

یان:

چۆن سەیری تابلۆیەکی هونەریی، ئەکەیت!؟

* * *

رۆژی ٩٨٩/٤/١٥

ببوورن، ئەگەر لەبەر ئاوێنەی ترس و بیمی زامی سامناکی هەڵەبجەدا، بلەرزم و قەڵەمەکەم نەتوانێ رێك ورەوان، حەرفەکان دابڕێژێ. چونکە ئەو ئاوێنەیەی

هونەری مەزنی ئیوه، نیشانتاندام، موچرکەو باهۆزەو سل و راچەنین و چیژی ئەوەندە پیرۆزو هونەرمەندانەی لادروست کردم، کە بروا بکەن، شەرم ئەکەم و بتوانم بلیم سوپاستان بکەم!. بەلام و بەلام هەر زات ئەکەم و ئەلیم سوپاستان ئەکەم، چونکە هەر تەنیا پیشانگای هونەر - تان پیشانی من و بینەران نەداوە، بەلکو زامیکی هەمیشە خوین لەبەر رۆیشتووی مەسەلەی قەلاچۆکردن و داپاچینی پارچەیەکی جەستەی کوردستانتان هیناوەتە قسەو دەنگ و رەنگ...کە من پیم سەیرە، هونەرمەندو شاعیرو نووسەری ئەم سەردەمەی ئیمە، بتوانیت وا بە پەلە، هەر لەم سالیشدا، بە پیر ئەو زام و ژانانەوە بچیو ئەوەندە بە ئاسانی بە کیوی بەرزو سەخت و دژواری ئەم کارەساتە دەگمەن و کەم وینەیەدا سەرکەوێو بە چاوی هونەرمەندانە بتوانێ لە نزیکەوە زامەکە، وەکو خۆیو وەکو هەمیشە تازەو بەردەوام، ببینێو لەهەمان کاتیشدا بتوانێ ئاوینەی هەستی دوای دیتنەکەی، بۆ سەردەمەکەی خۆی بگێڕێتەوە.

بەراستی ئەم پشانگایەی ئێوە، رووداوە؛ کارەساتە.!

کارەساتێکی ئەوەندەش زیندووە، کە چاوی هەموو بینەرێکی راگوزاریش بە ئاسانی فیچقەی دلۆپە خوێنەکان، ببوورن رووباری خوێنەکەمان، ئەبینێو هەموو پێوانەکانی تابلۆکان، بەبێ جیاوازی، بێئەوەی پێوانەی تەنیا یەك ملم بەجێبهێلێ، رووداون.!

ئەبوایە دوای چەند دیدەنێکی ترم، هەستی خۆمتان بۆ بنووسمەوە، چونکە هێشتا نەهاتومەوەتە سەرخۆم، کە دیارە ئەم توانایەی هونەری ئێوە، بۆ هەژاندنی ئێمە، خۆی لە خۆیدا، مەبەست و پەیامی هونەرمەندو شاعیرە؛ کەدوای دیتن و خوێندنەوە، چی لای بینەرو گوێگر، جێئەهێلن!؟. هێشتا هەر ئەلەرزم و ئاسایی نیم. چونکە هەست ئەکەم بەڕاستیو بەڕاستی، لەبەردەم کاریگەورەی هونەریدام. تەنیا سەرنجی ئەم یەکەم دیدەنیەم هەر ئەوەندەیە: خۆزگە لەدامێنی تابلۆکاندا هیچتان نەنووسیایە. بۆ ئەوەی هەر تابلۆکان قسە بکەن. چونکە هەست ئەکەم خۆیان قسە ئەکەن. ئەجولێن...و دەنگ و جولەیان لە رۆحما دەنگ ئەداتەوە.

دوبارە سوپاس.

ڕۆژی ٩٨٩/٤/١٦

دوێنێ، لەدامێنی سەرنجە خێراو تێکڕاییەکەمدا نووسیم: خۆزگە ناونیشانتان لەسەر تابلۆکان نەنووسیایە! چونکە لە لایەکەوە هەندێ لە ناونیشانەکانتان مەبەست و ناوەڕۆکی تابلۆکان ناپێکن و لەلایەکی تریشەوە ئەگەر مەبەستیش بپێکێ، تەنیا یەك دیو، یەك ڕوو، یەك لایەنی ناوەڕۆکی تابلۆکان ئەپێکن. کە من هەر لە بنەڕەتەوە پێم وایە ناونیشان بۆ تابلۆ، بۆ شیعر، بۆ چیرۆك، بۆ زۆر کاری هونەریو کاری ئەدەبی، کارێکی سەخت و گرانە . چونکە کاری هونەریو ئەدەبی تازە، کارێکە، لە قاموسی وشە، لە قاموسی مانا، بەرینترو بەربلاوترە. ناوەڕۆك و مەوداو مانایان زۆر لەوە زیاتر هەیە، کە بەشەرحکردن، یان بە ناونیشان بۆ دانان بتوانرێ کۆتایی بە پەیام و مەبەستیان بهێنرێ. لەهەمان کاتیشا ناونیشان دانان ئەبێتە هۆی درکاندنی ئەو نهێنیە جوان و مزگێنیە کوت وپڕانەی، خۆیان لەدوو توێی تێکڕای کارە هونەریو ئەدەبیەکەدا حەشارداوەو بینەرو خوێنەر، دوای پشکینین و گەڕانی زۆرو ورد، بەچاوی هۆش و خەیاڵ، ئەتوانن ئەو جوانیانە بدۆزنەوەو هەستیان پێبکەن؛ چۆن!؟. بۆ وێنە: ئەگەر مانشێتی درشتی ڕۆژنامەیەك، لەبەشی سەرەوەی یەکەمین لاپەڕەیدا بنووسێ: (١٠ ملیۆن دۆلار، بۆ ئاوەدانکردنەوی کوردستان، تەرخانکرا). ئیتر خوێنەر، ئەوەندە خۆی بە ناوەڕۆکی هەواڵەکەوە خەریك ناکات، کەلە جێگەیەکی تری ڕۆژنامەکەدا نووسرابێو تێئەگات کە پوختەی هەواڵەکە، بریتیە لەناونیشان و دێڕی سەرووی هەواڵەکە.

بەڵام ئەگەر هەر جۆری ئەم هەواڵە، بۆ زۆربەی ناونیشانی کاری هونەریو ئەدەبی، دابنرێت، ئەوا ئیتر خوێنەرو بینەر، ئارەزووی پشکنینی ناوەڕۆکی کارەکە ناکەن و بە خوێندنەوەی ناونیشانەکان، کەمێك ئۆخژنیان دێت. کەواتە دانان و هەڵبژاردنی ناونیشان، بۆ کاری هونەریو ئەدەبی، کارێکی گران و ئەستەمەو ئەبێ زۆر ژیرانە، بیری لێبکرێتەوە. ئەمە باسێکەو جێگەی ڕازو خوازە. تەنانەت هەندێ شاعیرو هونەرمەندی گەورەی دنیا، ڕایان وایە، کارەکانیان، بەبێ ناونیشان بێت، چاکترو بەچێژترە. ڕاستیش ئەکەن،چونکە کاری هونەرییو ئەدەبیی ڕەسەن، حیسابی زیندەوەرێکی زیندووی بۆ ئەکرێ، کە ئەم زیندەوەرەش وەك تێکرای مرۆڤ، بە تەنیا سەیرکردنێك، هەموو نهێنیەکانی ژیانی نازانرێت. بەڵکو پێویست ئەکات لەنگەرێکی وردو درێژخایەن، لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیانی بگیرێت. هەر بەو

ڕاوەگرێنك

جۆرەش کاری گەورەی هونەریو ئەدەبی، بە یەکەمین بینین و دووەم و سێیەم..هتد. مانای خۆیان بەدەستەوە نادەن و هەروا زوو تێیان ناگەیت. خۆ ئەگەر وا زوو تێیان بگەیت، مانای وایە بەرهەمێکی زیندوو نین و ئەلبومی بیرەوەریو نهێنی ژیانیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵنەگرتووە. لەهەمان کاتیشدا ئەم کارە، تەمەڵییو بێدەربەستی لای بینەرو خوێنەر دروست ئەکات، سەبارەت بە ئەرکی سەر شانیان بەرامبەر تێگەیشتن لەکاری هونەرییو ئەدەبیی..و رەنگە هەتا رادەیەکیش هەندێ خوێنەرو بینەر، حەز بکەن بەو تۆزە تێگەیشتنە. ئیتر کارە هونەریو ئەدەبیەکە، دەست لە یەخەیان بکاتەوەو ئەوەندە بیرکردنەوەیان داگیر نەکەن. بەڵام کوا؟ کەی؟ بەرهەمی هونەرییو ئەدەبی مەزن، هەر تەنیا یەك مەبەست و یەك مانایان هەیە! تا یەك ناونیشانیشیان هەبێ؟ بە پێچەوانەوە، کاریگەورە ئەوەیە، هەتا لێی ورد بیتەوە، هەر مانای زیاتر، خەیاڵی دوورتر، مەودای بەرینتر بە بینەرو خوێنەر بدەن.

لەزمانی پیکاسۆی هونەرمەندەوە ئەوترێ، گوایە لە پیشانگەیەکیا ئافرەتێك، تابلۆیەکی لە پیکاسۆ کڕیوە، دوای ماوەیەك ئافرەتەکە بە گەشکەو شادییەوە ئەچێتەوە لای پیکاسۆو پێی ئەڵێ: ئێجگار بەختەوەرم، چونکە پاش لێوردبونەوەیەکی زۆر، توانیومە لە رەمزو هێماو ناوەرۆکی تابلۆکە بگەم. پیکاسۆ - ش تکای لێئەکات، کەرازی بێت،نرخی کڕینی تابلۆکەی لێ وەربگرێتەوەو تابلۆکەی بێنێتەوە. ئافرەتەکە سەری سوڕ ئەمێنێ. ئەڵێ: بۆ؟!. پیکاسۆ پێی ئەڵێ: چونکە ئیتر تابلۆکەم جێی سەرنج و وردبونەوەی تیا نامێنێو هەرچۆنێ سەیری بکەیت، هەر ئەو سنوورو مەودایە، بۆ ئاسۆی بیرکردنەوەت، دائەنێیت، کە ئێستا بۆت داناوە.

لەبەر ئەوەش کە تابلۆکانی ئێوە، شایانی ئەوەن بە هێمنیی سەرنجیان لێ بدرێو دوور لە هات و هاوارو بەرزکردنەوەی دروشمەوە لەسەرخۆ، بەزمانی هونەر، بۆ بینەر ئەدوێن، بۆیە ئەو ناونیشانانەیانم بەزیاد زانیو جوانتر وایە هونەریش هەروا حەز ئەکا، کەبینەر، لەرێگەی رەمزو، ئاکامی سەرنج و ئیحای دەرخستنی هێمای هێمنی هونەرمەندانەوە، هەر سەیریان بکات و سەیریان بکات.

ئەم باری سەرنجەم ئەمباتەوە بۆ ئەو یادگارو بیرەوەریە ساکارو سادەیەی سەرەتای کاڵ وکرچی تێگەیشتنم بۆ هونەرو بۆئەدەب، ئەیدامێ. بیرمە، بۆ یەکەمین جار کە بەدوای مانـاو ناوەرۆکی ئەم بەیتە شیعرەی شیرین بەهارەی

ئیبراهیم ئەحمەد - دا ئەگەڕام، هەمیشە ئەم ووت: ئاخۆ مەبەستی شاعیر چی بێت، کە ئەڵێ:

به گریانی وشك، به ناڵەی بێدەنگ
دێنمه لــــەرزین، تەختی کردگار!

ئاخۆ مەبەستی لە گریانی وشك و ناڵەی بێدەنگ چی بێت!؟. کوا گریانی وشك و ناڵەی بێدەنگ هەن!؟. کەچی کە ڕۆژان تێپەڕین و کاری هونەرمەندێکی گەورەی وەك چارلی چاپلن — م بینیو لە فیلمەکانیا تێی گەیاندم، کە هەندێ ڕەمزو هێمای بێدەنگ، زۆرجار ناوەڕۆك و مانای بەرزیان تیایە؛ ئەوسا تێگەیشتم کە گریانی وشك و ناڵەی بێدەنگ یش هەن و کاری گەورەی خۆشیان ئەنجام ئەدەن. بۆیە ئەو وێنە بێدەنگ و بێشوێنەواری خوێن-ەی لەم تابلۆیانەشدا هەن، خۆیان دەنگ و خوێن و ستەم و تاوانن و پێویست بەوە ناکات ناونیشانی سەر تابلۆکان شەرحیان بکات.

ڕۆژی ۱۷/٤/۹۸۹

ئەمڕوش دوای زیاتر دیتنی تابلۆکان بەگشتی، هەست ئەکەم تێکڕای تابلۆکان بە هەموویان پێکەوە مانایەکی گشتی ئەدەن. لەهەمان کاتیشدا هەریەکەیان بەجیا، دنیایەکی سەربەخۆو تایبەتیان هەیە. کەبەلای منەوە، ئەمە سەرکەوتنێکە، کەم جار هونەرمەندو شاعیر ئەتوانن بە ئەنجامی بگەیەنن. چۆن؟!. لەوەلامدا ئەڵێم: زۆرجار ئەچیتە بەردەم کۆمەڵێك تابلۆی هونەرمەندێك، یان کۆمەڵێ شیعری شاعیرێك ئەخوێنیتەوە، هەست ئەکەیت هەموویان لەیەك ئەچن!. هەرچەندیش بە هەموویان پەیام و مانایەکی گشتیش بە دەستەوە بدەن، بەلام سەرومڕ، بە هەموویان لەیەك ئەچن. ئەمە ئەوەم بیر ئەخاتەوە وەك ئەو کارەکتەرەی لە ئەنجامی خۆنواندنێکیا، لە شانۆیەکدا، ئەوەندە ئەچێتە ناو گیان و دەروون و ئاکاری ئەو پاڵەوانەی، لەجیاتی ئەو، خۆی ئەنوێنێ، یان بە زمانێکی تر، ئەوەندە تقمص-ی پاڵەوانێك — ئەو پاڵەوانەی ئەم، دەوری بینیوە — ئەکات، کەدوای تەواوبوونی شانۆکەو دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆریش بەسەر نواندنەکەیدا، کەچی هەست ئەکەیت ئەو کارەکتەرە، لە هەڵس و کەوت و ڕەفتارو کرداری ڕۆژانەیدا، هەر ڕەفتاری پاڵەوانەکەی پێشووی دووبارە ئەکاتەوە، بەجۆرێك

هەندێ جار وا ڕووئەدات: ئەبێ بەو پاڵەوانە، بەو کۆمەڵە سیفاتەی ئەو پاڵەوانەی پێشوو. ئەم لایەنە، لەزۆر بەشی تری هونەریشدا هەروایە، وەك لای هەندێ گۆرانیبێژیش وایە. بۆ نمونە: گۆرانیبێژێکی گەورەی وەك عەلی مەردان، لە پاڵ ئەو هەموو توانا هونەریو دەنگە خۆشەیدا، کەچی کە کۆمەڵێ لە گۆرانیەکانی پێکەوە گوێ لێ بگریت — بەداخەوە — هەست ئەکەیت هەمووی، هەریەك عەلی مەردانە!. بە پێچەوانەوە لای گۆرانیبێژێکی تری وەك سەیید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئەمە هەست ناکرێ، بەڵکو لە هەر یەکێك لە گۆرانیەکانیا، سەیید عەلی ئەسغەرێکی سەربەخۆیە. لە گۆرانیەکەوە، بۆ گۆرانیەکی‌تر، کەبە هەمووی سەیید عەلی ئەسغەر پێکدێنن، واتە — ئۆکتافەکانی دەنگی - ، لە گۆرانیەکەوە بۆ گۆرانیەکی‌تر، زۆرجار جیاوازە. شاعیری بە دەسەڵات وسەرکەوتووش لەو کاتەدا توانای خۆی دەرئەخات کە تا چ رادەیەك ئەتوانێ لەنێوان شیعرێکیەوە، بۆ شیعرێکی تری، لەخۆی تێپەڕ بکات. واتە بتوانێ سەربەخۆیی‌و تایبەتمەندی شیعرێکی و شیعرێکی تری بپارێزێ. بە پێچەوانەشەوە، دەستەپاچەیی شاعیرەکە، لەوەدا دەرئەکەوێ، کە ئەگەرچی شاعیریش بێ‌و شیعری جوانیش بڵێ، بەلام کەدوای خوێندنەوەی تێکڕای دیوانە شیعرێکی، هەست بکەیت، تەنیا شیعرێکت خوێندۆتەوە؛ بەلام شیعرێکی درێژ، ئەوسا ئەزانێت کە شاعیرەکە، ئاووهەوای نیشتمانی شیعرێکی، سنعەتسازی شیعرێکی، تاقیکردنەوەی شیعرێکی، بۆ شیعری دواتری ئەبات و لە سنوورێکدا گیرو بێ‌دەسەڵات ماوەو ناتوانێ ئاڵوگۆڕ، بەسەر خۆیدا بهێنێ.

- تابلۆکانی ئێوەش، ئەو تایبەتمەندییە هونەرییەم لادروست ئەکەن، کە ئەگەرچی هەر کۆمەڵە تابلۆیەکی، هی هونەرمەندێکە، بەلام لەناو ئەو کۆمەلانەشدا، تابلۆکان بەجیا جیا، سەربەخۆیی خۆیان هەیەو دواییش بە هەموویان یەك پەیامیان هەیە.

ڕۆژی ۱۸/٤/۹۸۹

پەیامی هونەرو ئەدەب، لە بە پیرەوەچوونی کارەسات و بۆنەدا، کارێکی ستەم و گران و ناسکە. کەم جار وابووە، ئەو جۆرە بەرهەمانەی پێیان ئەوترێ: موناسەبات، زیندووبن، نەمرن. بەڵکو تەمەنیان وەك تەمەنی گولاڵەسوورەی

بەهارو ڕێواس و قارچك، کە خایەنە. هەر لەبەر ئەمەشە، زۆربەی بەرهەمی ئەدەبیی‌و هونەریی موناسەبات، لەو کارانە کەمتر ئەژین، کەژان و گینگڵ و خەمێکی ڕاستەقینەو ڕەسەن و ئەتوانم بڵێم وەك خەم و خەون و شتی تایبەتی ئەیبەخشی‌و ئەیدات. هەرچەندە ئەم قسەیەم بۆ سەرومڕی هەموو بەرهەمێکی سەر بە موناسەبات نیە، چونکە زۆر جاریش بووە بەرهەمێکی موناسەبات ئامێز، زۆر سەرکەوتوو بووە. بۆ نمونە: کەسێکی وەك مەولەوی تاوەگۆزی، کە سەرتاپای بەرهەمی شیعری بۆ موناسەباتە، کەچی تاقە کەسێکە، ئەتوانم بڵێم وێنەی کەمە، کە بۆ هەموو ڕوداوێك، تەنانەت بۆ بچوکترین ڕوداویش، شیعری نەمرو فرمێسکی شیعریی گەورەی ڕشتووە. ئەم دیاردەیەی مەولەوی، دیاردەیەکی ئێجگار دەگمەن و تایبەتەو پێچەوانەی نمونەی ئەو بەرهەمانەن کە لە موناسەباتداو، کەسانیتر، بۆیان جێهێشتووین. ڕەنگە هەندێ بەرهەمی موناسەبات، لەکاتی گەرمیی‌و ڕۆژانی دەوروبەری موناسەبەکەدا، لایەکیان لێکرابێتەوەو وەك هونەرو ئەدەب، تەماشایان کرابێ؛ کەچی‌کەرووداوەکە تێپەڕی کردووە. یان کەزامەکە، سارێژ بووە، ئیتر بەرهەمەکەش لەگەڵیا سارد بۆتەوە.

ئەو سەرنجەی سەرەوەم، لایەنێکی تێکڕای سەرنجە گشتیەکەمە، دەربارەی بەرهەمی موناسەبات، بەڵام دیسان هەر موناسەبات، وا بە ئاسانی، ڕوونتر بڵێم: وەك کورد ئەڵێ: قازانی مێردان، بەحەوت ساڵ دێتە جۆش. ئەبوایەو چاوەڕێ ئەکرا، کارەساتی سامناکی وەك هەڵەبجە!، درەنگتر بجۆشی‌و بپیشی‌و دەم بکێشی‌و درەنگتر خۆی بەدەستەوە بدات. بەڵام لەم بەرهەمانەدا، ئێجگار زوو، هاتۆتە دەنگ و ڕەنگ و خۆی داوە بەدەست فریشتەی سیحری پەنجەی هونەری ئێوەوەو بەم تابلۆیانە، هێناوتانەتەوە ژیان و جووڵەو خولقاندنێکی نوێ.

دووبارە ، بۆ چەند جارێك دیدەنیم، وشەکانم ئەمنوسنەوە.

ڕۆژی ۱۹/٤/۹۸۹

ئەمڕۆش وەك ڕۆژانی تر، پیشانگاکەتان بانگی کردمەوە، بۆ دیتنەوەی. ئەوەی لە سەرنجی دوای دیتنەوەی ئەمجارەمدا، پێویستە بیڵێم ئەوەیە، کە زۆربەی تابلۆکان – جگە لە تابلۆکانی منالانی هەڵەبجە _، شێوە هونەرێکن، ئەتوانم بڵێم: لە – کۆلاژ، پۆستەر –، یان پۆستەر کۆلاژ – تێکەڵن. تێکەڵکردنی ئەم دوو شێوە

هونەرەش، کارێکی کەمێ گرانە. چونکــە: کــاری کــۆلاژ، مەبەســت لەوەیــە، لــە کەرەسەی خاوی بابەتێك، رووداوێك، کارێکی تری هونەریی ئــەنجا م بــدرێ. بــەڵام کاری پۆستەر، پوختەی مەبەستێکی تایبەتە، بچووك و ئاسان و سادە ئەکرێتــەوە، بۆ ئەوەی چاوی بینەری راگوزاریو تیژڕەو، بەخێرایی ببینــێو هــەر بــە خــێراییش مەبەستەکە بپێکێ. لەبەر ئەوە بیرکردنەوە لە سادەیی ئەم لایەنەو تێکەڵکردنی بــە شێوەی کۆلاژ، کارێکی گرانتر لە ئەستۆی داهێنەرەکەی بار ئــەکات. بــەڵام کــەم و زۆر دەستی هونەرمەندانەی هەرسێ هونەرمەندەکە، توانیوێتی ئــەو ئاوێتەکردنــە، لــە بــەرژەوەندی سەرخســتنی لایــەنی هونــەری بســازێنیو هــاو ئاهەنگییــەك لــە تێکەڵکردنی شێوەی کۆلاژو رێبازی پۆستەردا دروست بکات. کە بەڕای من، هــۆی بنەڕەتیی بۆ ئەم سەرکەوتنە، ئەگەڕێتەوە بۆ لایەنی ئەو مۆنتاژە وردو خاوێنەی کە بۆ تابلۆکان بۆتە کۆلەگەی تــاکنیك و هەندەســەی میعمــاری تابلۆکــان. جوانــترین نمونەی ئەم ئاوێتەکردنــەی نێــوان کــۆلاژو پۆســتەر، تابلۆیــەکی هونەرمــەند کاکــە رێبوارە، کەلەناو کەرەسە خاوەکانی کارەساتی هەڵەبجەدا، وێنەیەکی لــەو ســەدان و هەزاران وێنانە هەڵبژاردووە، کە دیمەنی دایك و کۆرپەیەکی شــەهید، لــەپاڵ یــەکدا کەوتون و ئەم، بە سەلیقەیەکی هونەرمەندانە وێنەی دایکەکەی دەست بۆ بــردووە، کە بە مقەســت لــە وێنــەی کۆرپەکــەی جیاکردۆتــەوەو لەشــێوەی پــاڵ کەوتنــەوە، گۆڕیوییێتی بۆ راوەستان بە پێوەو کــە مۆنتــاژی کــردووە، وا کەوتۆتــەوە، کەلــەناو شەهیدەکانی دەوروپشتیا، وەك ئەوە وابێ لــەدوای شــەهیدکردنەکە، هەڵســابێتەوە سەرپێو بەژیرانەش ئەوەی زانیوە، کە ئەگەر شێوەی پاڵ کەوتنەکەی بکرێتەوە، بــۆ بە پێوە راوەستان، دەستێکی بۆ ئاسمان بــەرز ئەبێتــەوە. وەك ئــەوەی بیــەوێ بــەو دەستە، خۆر دابگرێ، یان بیەوێ تۆڵە بسێنێتەوە. هەڵسانەوەو هەڵساندنەوەی ئــەم شــەهیدە، وەك پەیکــەرێکی مــەزن، هەڵســـانەوەی دوای ئــەو حاڵەتەیــە، کــە داگیرکارەکە، وای زانیوە گوایە ئیتر لە هەڵسانەوەی ئەخات! بۆیە قۆستنەوەی ئــەم حاڵەتە، ئــەوەم پێ ئــەڵێ کــە: موناســەبەی شــەهیدکردنی هەڵەبجــە، هەڵســانەوەو ژیانەوەی هەڵەبجە — دروست ئەکاتەوە.

ئەوەی لەدیدەنی ئەمڕۆمدا لەم رووەوە ئەیڵێم ئەو لایەنەیــە کــە بــۆ یەکــەمجاری منە، هەست بکەم رووداوێك خۆی بــدوێ، خــۆی لــە ئێســك و پروســك و خوێــن و دوکەڵ و دەست وقاچی پەڕیوو و روخساری شــێواوی خــودی شــەهیدەکان، بــبن بــە

کەرەسەیەکی تری هونەریو دووبارە ئەو کەرەسانە، لە دڕندەیەتیو دزێویی‌و ستەمی ئەم سەردەمە، راپەڕنەوەو بە ڕاپەرینەکەشیان، بەهرەو هونەری جوان بخولقێنن. واتە دیتنی شتی جوان، لە شتی ناشیریندا. مەبەستیشم لە شتی ناشیرین، دڕندایەتیو ستەمی ئەو رژێمەیە، کە ئەو جوانیانەمانی وا ناشیرین کردووە. بەلاّم دەستی هونەر، دووبارە جوانیەکانمان بگێڕێتەوە بۆ دۆخی جوانترو هونەریتر.

رۆژی ٢٠/٤/٩٨٩

ئەمڕۆش سەردانی پیشانگاکەتانم کردووەوە. ئەمجارە لای بەشی منالاّنی هەلّەبجە، لەنگەرم گرت. کە بەرهەمی دەست و پەنجەی هێشتا خاو و بچووکی لە مردن و خنکانی ناو گازی ژەهراوی دەربازبووی ئەو منالاّنەن، کە میراتگری راستگۆو شایەتی مێژوویی کارەساتی بەژەهر رەشەکوژی شاری گولّ و شیعری هەلّەبجەن...هەلّەبجەی ئامێزی مەولەوی‌و تایەربەگی جاف و ئەحمەد موختارو گۆران و کەمالی‌و...

ئەم تابلۆیانە، زمانێکی تری ئەو منالاّنەن، کە خۆیان ناتوانن وەك مرۆڤی گەورە، بەزمان و بەدەم، لە لایەنەکانی کارەساتەکە بدوێن. بەلاّم پەنجە نەمەییوەکانیان، تەرجومانی رەنگدانەوەی ئەم کۆستەیە، کەپێش هەموو کەسێك، راستەوخۆ بەسەر خۆیاندا هات. چونکە ئەم منالاّنە، ئەو منالاّنەن، کە باوك و دایك و براو خوشك و خزم و کەسیان، بوونە قوربانی گازی ژەهراوی‌و بەچاوی خۆیان، بۆ هەتا هەتایە، دیمەنی ئەو قەلاچۆکردنانە، لە بیرەوەریاندا ئەژی؛ کە هاوارو بانگی قوربانیەکان، لاشەی بە کۆمەلّ کەوتووی کەس و کاریان، زرمەو نالّەو تەقینەوەی بۆمباکان، هاڕەی فڕۆکەکان، زریکەی دایك و کچ و منالاّنی هاوڕێیان و ...هەزاران و ..هەزاران دیمەنی تری سامناك، لە تابلۆی بچووك و پاك و ساکاری ئەم مندالاّنەدا رەنگ ئەداتەوە. ئەشیّ لەبەر هەر یەکیّ لەم تابلۆی منالاّنەدا لەنگەرو هەلّوێستەیەکی درێژخایەن بگیریّ، بۆ ئەوەی ئاوڕێکی درێژ، سەرنجێکی ورد، لە کارەکانیان بدریّ. بەلاّم تابلۆکان زۆرن، بۆیە تەنیا لای چەند تابلۆیەك ئەوەستم.

تابلۆیەك رایوەستاندم، کەوەك تابلۆکانی هاوڕێیانی‌تری، رەنگاورەنگ بوو، تابلۆیەك بوو، بریتی‌بوو لە دیمەنی بۆمبارانی هەلّەبجە. چەند فڕۆکەیەك هێشتا

بەسەر ئاسمانە شیعراوییەکەی هەڵەبجەوەن و بەژەهر باراندن، خەریکی قەلاچۆکردنی زیندەوەرانی ناو شارەکەن. بەلاّم هەستی ئەم منالە، وای بۆ چووە، کە مادام گازی ژەهراوی ئەنیشێتە سەر زەوی و ئەوسا کاری خۆی ئەکا، بۆیە ئەم منالـە بـیرتیژە، بیری لەوە کردۆتـــەوە، بـۆ ئـەوەی زیندەوەرانـی ژێـر گـازە ژەهراویەکـە، لـەمردن رزگاریان ببێ ، هاتووە ئەو گیانلەبەرانەی ئەتوانن بفڕن و بچنە سـەروو دەسـەلاّتی گازەکەوە، بـاڵی پێگرتـوون و فڕیـون بـۆ ئاسمـانی ژوور دەسـەلاّتی گازەکـە. لـەو باڵدارانە: چەند پەپوولەیەك و کۆترێك، خـەریکن بگەنـە نزیـك پەڵەهـەورێك، کـە دیارە ئیتر لەمردن رزگاریان ئەبێ. یان بـە واتەیـەکی‌تر، دوای ئـەو قـەلاچۆکردن و کوشتارگەیە، ژیان لەگەڵ خۆیاندا هەڵ ئەگرن و ئەو خەونە گلاّوەی (صدام) پۆچـەڵ ئەکەنەوە، کە ئەیویست دوا زیندەوەر لە هەڵەبجەدا نەهێڵێ. بەلاّم ئەو باڵندانە لـەو خەونەی صدام گەورەترن و دوای کارەسـاتی هەڵەبجـە -ش، هەڵەبجـە هـەر ئـەژیو لەسەروو دەسەلاّتی صدام — ەوەیە.

ئەم تابلۆیە، کەشتیەکەی -نوح-م بیر ئەخاتەوە، کە لە تۆفانەکـەدا، تـەنیا ئـەو زیندەوەرانە لە مردن رزگاریان بوو، کە سواری کەشتیەکە بوون. لەبەر ئەوە لـێرەدا رەمزی پەڵـە هەورەکـەش رەمـزی پـاکیتی و فریشـتەیی و نمونـەی دڵپـاکین، کـە هەموویان وەك دڵی منال، دڵیان سپی و بێگەردە.

تابلۆیەکی تریش، بریتیە لە تابلۆی منالێکی‌تری هونەرمەند خـاوەنی تابلۆکـە- وەك بیستم- سێ خوشکی لە کارەساتی هەڵەبجەدا شـەهید بـوون و ئـەمیش لـەم تابلۆیەدا، کە بۆی کردوون، وەك لە بیرەوەری و یادگاری رۆژانەی خۆیدا مابێتـەوە، ئەوەیە کە دێتەوە یـادی. رۆژێـك لـە رۆژانـی بـەهارێك، سـێ خوشـکی هـەبوو، خوشـکەکانی هەرسـێکیان پێکـەوە، دەسـتیان بـە یەکـەوە گرتبـــوو، لــە نـاو سەوزەگیایەکدا، یارییان ئەکرد، خۆرێکی گەش لە نێوان ریزە شاخەکانی پشتیانەوە پرشنگی ئـەپژا و درەخـت و سروشـتیش بۆیـان پێ‌ئەکـەنی. بەراسـتی هێڵـەکانی تابلۆکـەی، ئـەوەندە ئازایانـە و چاوقایمانـە کێشـاوە، کـە مەگـەر دەسـتێکی هونەرمەندانەی خاوەن تاقیکردنەوە بتوانێ ئەوەندە بێ‌پەروا رەها بیانکێشێ.

رۆژی ٢١/٤/٩٨٩
بەو چەند سەرنجە خێرایەی رۆژانی پێشـوومدا، بـە وشـە، هـەموو پیشـانگاکەم

رازاوەگرنگ

بینی. ئەوەی منالآن و ئەوەی کاکە عوسمـان و کاکـە ڕێبـوارو کاکـە ئـاکۆ – ش.
بەلاّم وەك چوونە ناو شارێکی گەورەو ڕەنگین و پێشکەوتوو؛ سـەرەتا هـەر سـیمای تێکڕای شارەکە، شتێکی تایبەتیت لا دروسـت ئـەکا، پاشـان وردە وردە، بـەزیاتر پشکنین و گەڕانی شارەکە، ناوی گەڕەکەکانیو ناوی ناودارەکانیو شەقام و ڕووداوە مێژینەکانیو..هتد. فێر ئەبیت. ئەم دیدەنیـە تێکڕاییـەی منیـش هـەروابوو. وەك یەکەم دیدەنی ئەوشارەی کە لادێیەکی دوورە شـار، تێـی ئـەچێت، هـەروا بـە واق وڕماویو حەپەسان و سەرسوڕمانەوە لە شتەکانم ئەڕوانیو پێشەکی ئـەو تابلۆیانـە سەرنجمیان بۆ لای خۆیانـا ڕاکێشـا، کـە ڕادەو ئاسـتی هونـەرییان لـەچاو دەسـتە خوشکەکانی تریاندا، لەبەرچاوترو دیارتر بوون. لەبەر ئەوە سەرنجم هێشتا پـەرت و هێشتا بزرکاوی ترس و بیمی یەکەم دیدەنیمی پێوەیەو هێشتا زەبـری دەسـەلاّت و ڕاچلەکینی هونەرییانەی ئێوەی پێوەیـە. چـەند نـەمرو کاریگـەرە، ئـەو هونـەرەی ئەتوانێ مێروولەی ژێر پێستی لەشی بینەر، دروست بکات و بینەر واهەسـت بکـا: لەکاتی دیدەنی تابلۆکاندا، لەزەوی دابـڕاوەو سـاتەکانی دیدەنیەکـەی لـە واقیعـی ئاساییو ڕۆژانەی، بالاّترن.! سوپاستان ئەکەم، کە دەستی سیحری حەلال و هونەری سپی ئێوە، پەلی ڕۆحمیان گرت و بۆ چەند دیدەنییەکی کـورت و بـەتام، لـەم دنیـا ساردو تاریکەی ئێستامی بلند کردمەوەو بردمـی بۆنـاو بـاخی ئاوێنـەو سـەرتاپا گەش و ڕوناکی هونەرەوە.

* نووسەری کوردستان – ژمارە ١٥ – ناوەڕاستی بەهاری ١٩٨٩ز

شیعرەکانی
ژمارەی پێشووم خوێندەوە
گۆڤاری نووسەری کوردستان - ژمارە ٢ - ١٩٨١

# =١=
# سوارە ئیلخانیزادە

سەرەتایەکی پێویست:::

تا ئێستاش لای ئێمە، کەباسی ئەدەب و ئەدەبی کوردی ئەکرێ، بەداخەوە خەڵکی یەکسەر شیعریان بیر ئەکەوێتەوە. بۆیە هەر گۆڤارو رۆژنامەیەك لەدایك ئەبێو بانگەواز بۆ ئەدیبان بلاوئەکاتەوە، تابەرهەمی خۆیانی بۆ بنێرن، پێش هەموو بابەتێکیترو بە پەلە، دەیان شیعری ئەگاتێ!. بەڵگەی ئەم دیاردەیە، گۆشەی پۆستەی خوێنەران-ی زۆربەی گۆڤارو رۆژنامەی کوردییە، کەهەر ژمارەیەکیان وەلامی دەیان لەو جۆرە شیعرو کۆلکە شیعرانە ئەداتەوە.

دیارە ئەم دیاردەیە هۆی زۆرە؛ کەهۆی سەرەکی ئەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی شیعر خۆی لەناو ئێمەدا، لەچاو بابەتەکانی تری ئەدەبدا. هۆی لابەلاشی رەنگە زۆریی ژمارەی شاعیر بێت. چونکە ئەگەر ئەم دیاردەیە لە سەدەکانی پێش ئێستادا وابووبێت، ئەوا ئێستاش سەرەڕای ئەوەی لایەنەکانیتری ئەدەب، خەریکی گەشەکردنن، کەچی هەر ژمارەی شاعیر لەچاو ژمارەی رەخنەگرو توێژەرەوەو چیرۆك و رۆمان نووس و شانۆنامە زۆرترن و..لەکاتێکا ئێمە پێویستمان بە گەشەسەندنی لایەنەکانی تری ئەدەب هەیە، تا شانبەشانی شیعر، مەیدانە هەمەجۆرەکانی ئەدەب پڕ

بکەنەوە. چونکە هەتا ئیمڕۆش دەیان شاعیری وەك مەلای جزیریو ئەحمەدی خانیو نالیو سالم و مەولەویو مەحویو پیرەمێردو گۆران و... پشتگوێ خراون و ئەگەریش هەندێکیان شتێکیان لەسەر نووسرابێ، هێشتا بە بەریانەوە هەیە دەیان لێکۆڵینەوەو نامەی دکتۆرایان لەسەر وەربگیرێ. دیارە ئەمە باسێکی چڕەو گەڕان و پشکنین بەدوای رەگ و هۆیەکانی ئەم دیاردەیەدا، گەلێ پەلوپۆی لێئەبێتەوە. ئەوەی من پێشنیاری ئەکەم بۆ چارەسەرێکی کاتیی، هان نەدانی بلاوکردنەوەی شیعرە، لەگۆڤارو رۆژنامەکاندا، بەو شێوە زۆرەی کە بابەتەکانی تری ئەدەب بکات بە ژێرەوە.

هەر لە سەرەتای کارکردنماندا لە گۆڤاری خۆشەویستی نووسەری کوردستان دا، لەگەڵ برایانی دەستەی نووسەرانی لیژنەی ئامادەکردنی یەکێتی نووسەرانی کوردستان، بڕیارماندا شیعر لە گۆڤارەکەماندا کەم بکەینەوەو بواری شیعر تەسك بکەینەوە. تا بابەتێکی بەکەڵك لەبەر دەستماندابێ، شیعر پشتگوێ بخەین. بەتایبەتی بایەخ بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو چیرۆك و رەخنەی دڵسۆزانەی ئەدەبیی بدەین. چونکە لەناو بەشەکانی تری ئەدەبدا لە رەخنەدا، ئێجگار هەژارو ساواین و ئەوەی لەم بوارەدا هەمانە بریتیە لە دوو جۆرە رەخنەو لێکۆڵینەوە؛ کە یەکەمیان رەخنەی دروستکارو زانستیەو زۆریش کەمە، دووەمیشیان رەخنەی روخێنەرو نازانستیانەیە، کە زۆر زۆرە. لەبەر ئەوەی بۆ هاندانی یەکەمیان و، بنبڕکردنی جۆری دووەمیان، بەچاکی ئەزانین گوێ بدرێ بە رەخنەی زانستییانەی دوور لە خواست و ئارەزووی کەسایەتیو بریندارکردنی کەسایەتی نووسەران. چونکە ئەوەی شوێن پێی ئەمجۆرە نوسینانەی هەڵگرتبێ، کەبەناوی رەخنەوە نووسراون، ئەزانێ ئەمجۆرەیان چەند لێڵ و تاریك و بە شێوەیەك رەنگی تاریکیی پێوە دیارە، کە ئەگەر کەسێکی بیانە، چاوی بەو جۆرە نوسینانە بکەوێ، یەکسەر وا هەست ئەکات ئەدەبی کوردی، هیچ نیەو کورد، ئەدیب و شاعیری نیەو ئەگریش ببێ، هەموویان کۆنەپەرست و بێتواناو..هتد. لەکاتێکا ئەمجۆرە نوسینانە، خۆیان پەڵەیەکی تاریکن و بەزۆرەملە بە رەخنەو لێکۆڵینەوەی تازەی کوردییەوە

لکێنراون و پێویستە روناکبیران بە چاوێکی هۆشیارانەوە بڕواننە ئەم پەڵە تاریکەو لەناو ئەم تاریکاییەدا، رووە رووناك و گەشەکەی شیعرو ئەدەبی کوردی بەدی بکەن. چونکە ئەگەر ئەدەبێکی هەژاریشمان هەبێ، سەرەرای ئەو هەژارییەشی سیمای مرۆڤانەو بەرگریکردنی لە گەل و بەرەی زەحمەتکێشانی گەل، ون نەکردووەو تێکرای بۆ بەدیهێنانی بەختەوەریی و پاشەرۆژی روناکی گەلی کوردو گەلانی دنیایە.

* * *

لەژمارە - ١ - ی گۆڤاری خۆشەویستی نووسەری کوردستان دا دوو شیعری بلاوکراوەتەوە:

١ ـ خەوە بەردینە: سوارە

٢ ـ سووتان لەبەر باراندا: رەفیق سابیر

١ـ خەوە بەردینە: شیعرێکی درێژی سوارەیە.

سوارە ساڵی ١٩٣٧ لەگوندی قەرەگوێزی ناوچەی بۆکان، لەدایکبووەو ساڵی ١٩٧٥، لەتەمەنی ٣٨ ساڵیدا بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە.

ئەگەرچی روناکبیرانی کوردستان بەگشتی، هێشتا تەواوی ئەو چەند شیعرە کەمەی ئەم شاعیرەیان نەدیوە، بەلاّم لە روانگەی ئەو مشتەوە، کە نمونەی خەروارێکە، سوارە سەرەتای سەرهەڵدانی رێبازێکی تازەبوو لە شیعری کوردیدا.

ئەو شیعرەی لە کوردستانی ئێراندا باوبووەو ئێستاش لەدنیای شیعری هێمن و هەژارەوە ئەبینرێ، لەسەر دەستی سوارەدا، لە ساڵانی پەنجاکانەوە بەدواوە، سەروبن هەموو بناغەکانی هەڵوەشایەوەو لە هەموو رووەکانی تەکنیك و کێش و سەرواو مەودای وشەوە، شەقڵی تازەی بەسەردا هێنا.

ئەم شاعیرە بۆ یەکەمجار لە کوردستانی ئیراندا رچەی لاسایی و چاولێکەریی شکاند و ئالاّی دەست پێکردنی تازە بوونەوەی شیعری هەڵکرد. تازە کردنەوەی شیعری کورد لە کوردستانی ئێراندا، ئەگەرچی لەچاو تازەکردنەوەی شیعری کوردی لە کوردستانی عێراقدا بەدواترە، بەلاّم بۆ کوردستانی ئێران، کە شیعری فارسی زۆر دەمێك بوو، شاعیرانی

فارس، شۆڕشی شیعرییان تیا کردبوو، ئەبوایە شیعری کوردیش لەو پارچەیەدا، شتێك بکات. سوارەش بەو هۆیەوە کە لە کۆلێژی حقوق -ی تاران ئەیخوێندو، روناکبیرێکی هۆشیار بووە، بۆیە ئاگاداری شۆڕشە ئەدەبیەکانی گەلانی دوورو نزیك بووەو زۆر زیرەکانە لە شیعر گەیشتووە.

ئەو سالانەی سوارە، ئەم ئەرکەی تێدا گرتە ئەستۆ، دڕندەیەتی رژێمی دیکتاتۆری شای ئێران، لە لوتکەدا بوو. بۆیە شیعرەکانی سوارە، دوو نیشان ئەپێکێ: یەکەمیان شکاندنی رچەی شیعری پێش خۆیو دووەمیان لەئامێزگرتنی ئەو هەموو مەبەستانەی لە چوارچێوەی رەمزو هێماو ئیشاراتی شاراوەدا، شیعرێکی قوولْ دارێژراوو پڕ نهێنی ئەبن. شیعرێك کە بە راگوزاریانەو بە سەرپێیو خێرا، نەخوێندرێتەوەو لایەنە جوانەکانی، بە پەلە، خۆیان بەدەستەوە نەدەن. شیعرێك کە بە پێوانەی دڕندەیەتی سەردەمەکە، ئەبێ بە شیعرەکەشدا شۆڕ بیتەوە؛ شۆڕبوونەوە بۆ ناو بێشە چڕو تەنگ و ئاخنراوەکانی ئەو رەمزو نیشانانە. لەبەر ئەوە لە خوێندنەوەی هەموو شیعری سوارەدا، وا هەست ئەکەیت کە وشەکان زۆر توندو تۆلْ، خراونەتە پالْ یەك و رستەکانیش توندتر بە یەکەوە نووسێنراون. کە بەم کارە، تێکڕای هەموو شیعرەکە، شێوەی پتەوییو توندو تۆلیی پێوە ئەبینرێ. شێوەیەك ئەدۆنیس واتەنی: تەکنیکی شیعرەکە ئەوەندە توندوتۆلْ بێت، وەك پایەی خانوویەك، کە ئەگەر خشتێك ، یان بەردێکی لێ دەربهێنرێ، سەرتاپای خانووەکە ئەڕوخێ.

بەکورتی شیعری سوارە، دیاردەیەکی تازەو تایبەتییەو مۆرکی سوارەیەتی پێوە دیارە.

من لام وایە، ئەگەر ئەم شاعیرە، لەو تەمەنەدا (٣٨ سالْ)، جوانەمەرگ نەبوایە، تازەبوونەوەی شیعری کوردی کوردستانی ئێرانیش، وا زوو جوانەمەرگ نەئەبوو. چونکە ئەوەی ئەم جوانەمەرگ بوونە ئەسەلمێنێ، کپبوونەوەی تازەبوونەوەکەی سوارەیە.

ئێستا ئەگەر لە کوردستانی ئێراندا، چەند دەنگێکی تری جیاواز لە دەنگی هێمن و هەژار هەبن، هەر هەمان رێچکەی سوارەن و هیچیان نوقلانەی دیژەپێدانی تازەکردنەوەکەی سوارە بە گوێی شیعری کوردیدا

ناچرپێنن؛ به پێچەوانەی ئەو دیاردەو شوێن پەنجەیەی کە شیعری گۆران، لەسەر شیعری سەردەمی خۆیو دوای خۆی لەسەر شیعری تا ئێستای شاعیرانی کورد بە جێهێشت.

لێرەدا ئەگەر لەنگەرێك بگرین و بڵێین: بۆچی شیعری گۆران، لەسەردەمی گۆران خۆیداو تا ئێستاش شوێن پەنجەو تارمایی بەسەر شیعری کوردیو شاعیرانی دوای خۆیەوە، دیار نیە!؟ لەوەڵامدا ئەڵێین:

١ـ تاقیکردنەوەی تازە گەرییەکەی گۆران، تاقیکردنەوەیەکی ئاوەکیو نامۆ نەبو، لە ئەدەبی کوردیا. چونکە گۆران ئەگەر هەندێ چاولێکەرییو تاقیکردنەوەی شاعیرانی ئەو سەردەمەی تورك-ی پەیڕەو کردبێ، بەڵام لە بنەڕەتدا گۆران ئاوڕی لە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردیو کێش-ە خۆماڵییەکانمان دایەوە؛ کە بیرهێنانەوەی ئەمجۆرە تاقیکردنەوانە، گەڕانەوە بوو بۆ سەرچاوە رونەکانی دێرینەمان و جەماوەری خوێنەرانیش پێیان خۆش و چاك بوو.

٢ـ تاقیکردنەوەی گۆران، تاقیکردنەوەیەکی تاکەکەسیو تاقانەو تایبەت بە گۆران-ەوە نەبوو. چونکە ئەگەر ئاکامی سەرومڕی تاقیکردنەوە شیعرییەکانی ئەو ساڵانەی گۆران-ی تیا درەوشایەوەو گۆران لەچاو دەستە شاعیرە هاوڕێکانیا، زیاتر دەرکەوت، بەڵام لەراستیدا تاقیکردنەوەکە، تەقەللایەکی هەرەوەزیو بە کۆمەڵ بوو. لەبەرئەوەی لە هەمان سەردەمداو بگرە پێش گۆرانی-ش، شاعیرانی تری وەك: پیرەمێرد، شێخ نوری شێخ ساڵح، ئەورەحمان بەگی بابان، رەمزی مەلامارف؛ کە جگە لەمی دواییان، ئەوانیتریان تەمەن و تاقیکردنەوەی شیعرییان، پێش گۆرانی-ش بوو. لەمەش تایبەتیتر، ئاوڕدانەوەو دەستپێشکەریی دێرینەو زیرەکانەی پیرەمێرد لە کێش-ە خۆماڵییەکانمان و گەنجینەی شیعری دەوڵەمەندو تەمەن دێژی شیعری شیوەی گۆرانی، کە ئەم شێوە زمانە، لەچاو شێوەکانی تری زمانی کوردیدا، بە تەمەنترو رەگ داکوتاوتر بوو.

٣ـ لەئاکامی تاقیکردنەوەی وا گەورەو بە کۆمەڵدا، خەرمانی تاقیکرنەوەکەش گەورە ئەبێ، بۆیە جێپەنجەی چەند شاعیرێکی ئاوا گەورەو بەتواناو پڕ تاقیکردنەوە، کە هەموویان پێش تەقەللای تازەگەریی، شیعری

کلاسیکی - یشیان پەیڕەو کردوە، لەسەر سەردەمەکەو دوای خۆیشیان و ڕەنگە تا درەنگانێکی تریش هەر بمێنێ.

بەلاّم تاقیکردنەوە شیعرییەکەی سوارە، ئاکامی بەمجۆرە نەشکایەوە، چونکە:

١ـ ئەو گەنجینە شیعرییەی کە سوارە تیایدا تەقەللای دۆزینەوەی کیشوەرێکی تری ئەدا، هەر بە تەنیا گەنجینەی شیعری کوردی نەبوو؛ بەلّکو چەند پەنجەرەیەکی تیابوو، کە هەر یەکەیان، بەسەر تاقیکردنەوەیتردا ئەیانڕوانی؛ وەك تاقیکردنەوەی دەولّەمەندو دێرینەی شیعرو ئەدەبی فارسیو هەر لە ڕێگەی ئەدەبی فارسیشەوە، پەنجەرەیتر بۆسەر تاقیکردنەوەی ئەدەبی هەمەجۆرەی گەلانی دنیا.

٢ـ تاقیکردنەوەی سوارە، تاقیکردنەوەیەکی تاکەکەسیو تاقانە بوو؛ کەلە تەمەنێکی ئاوا کورتدا، خەرمانی گەورەو دەولّەمەندی وەك سەردەمەکەی گۆران لەدوای خۆی بەجێ ناهێلّێ، کە نمونەکانی ئەم بەلّگەیەمان، تاقیکردنەوەی هەردییە، لای خۆمان و تاقیکردنەوەی رامبۆیە، لە فەرەنسا.

٣ـ ئەو رۆژگارو سەردەمەی سوارە، ئەم تاقیکردنەوە شیعرییەی تیا ئەنجامدا، بە بەراورد لەگەلْ رۆژگارو سەردەمی گۆران و دەستە هاوڕێکانیان، دو رۆژگارو سەردەمی جیاواز بوون، چونکە رۆژگاری گۆران و پیرەمێرد و هاوڕێکانیان، رۆژگاری ڕاپەرین و هەلّسانەوەی بیری نەتەوایەتیو زمان و ئەدەبی کوردیو هاتنە دنیای چەندان و بە یەکەوەی رۆژنامەو گۆڤاری کوردی بووەو بەرهەمی تازەگەرییەکەیان هەر خێراو بە ئەندازەیەکی بەرین و بەربلاّو، بە چاپکراوی بەسەر خوێنەراندا بلاّوبۆتەوە. بەلاّم رۆژگارو سەردەمی تازەگەرییەکەی سوارە، رۆژگاری گەمارۆدانی بیری نەتەوایەتیو قات وقری رۆژنامەو گۆڤاری کوردی بووە و لە هەمان کاتیشدا ژمارەی خوێنەرانی ئەدەب و فەرهەنگی کوردی، لەهەردو سەردەمەکەدا، جیاوازی نێوان ئاسمان و رێسمانە، لەبەر ئەوەی رۆژگاری تاقیکردنەوەی پیرەمێردو گۆران، لەژێر سێبەری یەکەمین دەسەلاّتدارێتی کوردیدا، بە ڕابەرایەتی شێخ مەحمود بووە؛ کە خوێندنی کوردی، کرایە زمانی رەسمی

دەوڵەت و دواتریش و دوای تێکچوونی دەسەڵاتە کوردیەکەش، نەتوانرا زمانی کوردی قەدەغە بکرێ. بۆیە ژمارەی خوێنەرانی تازەگەریەکەی گۆران و هاوڕێکانی، تا هاتووە بەربلاوتر بووە. بەلاّم بە پێچەوانەوە، ژمارەی خوێنەرانی زمان و ئەدەبی کوردیو لە هەمان کاتیشدا، شیعری سوارە، تا ئێستاش رەنگدانەوەی دژراوی، لە نیشتمانی سوارەدا، لەسەر پەرەپێدانی زمان و فەرهەنگی کوردی هەیە.

لەبەر ئەوە لەم هەموو گەمارۆدانەی سوارەدا، گەورەیەتی سوارە، لەوەدا دەرئەکەوێ کە لە شەوەزەنگێکی تاریك و سامناکدا، بە تەنیاو تاکەکەسی، رچەو رێبازێکی تایبەتی شکاند. کەبە دڵنیاییەوە ئەتوانین بڵێین: تازەگەریی سوارە، یان بە واتەیەکی تر، ئەتوانین بڵێین: چەند مەزنە سوارە، ئەو شاعیرەی لە یەکەمین تەقەللای تاقیکردنەوەی داهێنانێکیتردا، بازنەی شیعری چاولێکەریو یەکترچوونەوەو باوی جێهیشت و لە دەرەوەی ئەو بازنەیەدا، بانگەوازی دۆزینەوەی نیشتمانێکی جیاوازو تایبەتمەندی راهێشت و نەخشەیەکی تازەی خستە سەر جوگرافیای شیعری هاوچەرخی کوردی..و، بە تەنیاو لە دەرفەتێکی کورتدا، چەپکە گوڵی شیعری خۆی، لەگوڵدانی شیعری کوردیا داناو بۆن و بەرامەو تایبەتمەندی خۆی پێشکەش سەردەمەکەی کرد، کە دڵنیاین سەردەمەکانی داهاتووش، دەستاودەست و پشتاوپشت، بۆ یەکتری ئەگوێزنەوە.

ئەم شیعرەی سوارە (خەوە بەردینە)، سەرگوزوشتەی ئەو ئاوو سەرچاوانەیە، کە بە هیوای یەکتر گرتنەوە، بوون بە چۆم و رۆدەکەون و بە تەمان بگەن بە دەریا. بەلاّم لەرێگا، هەرکام بەدەردێك دەچن و هەریەك بەلایەکا، لادەدەن. تەنانەت ئاوی وا هەیە، راستەوخۆ دەبێتە دژی خۆی، دەبێتە بەرد؛ خەونی بەردین دەبینێ. تەنیا سەرچاوەیەك تەواو شارەزایە، هەم رێگای دۆزیوەتەوەو هەم ورەو باوەڕی بەتینە، ئەزانێ لە پێشا لەگەڵ جۆگەو جۆباری لەیەك نزیك، ئەبێ یەك بگرێتەوەو ببێ بە چۆم - زێیەکی گەورە-، کە گەلەکەی خۆیەتی..).

ئەگەر ئەو پێشەکییە کلیلی کردنەوەی دەرگای رەمزو هێماکان بێت بۆ تێگەیشتن و شەرحی شیعرەکە؛ هێشتا هەندێ لایەنی تری شیعرەکەم

مەبەستە:

١ـ دەست پێکردنی سەرەتای شیعرەکە:

شیعرەکە بە پێشەکییەکی درێــژە دەســت پێئــەکات. پێشــەکییەکی پــڕ وێنەو دیمەنی شاعیرانە. ئەم دەست پێکردنانە، بــەو جــۆرە پێشــەکییانە لــە شیعری داستان و بەیتە فۆلکلۆرییــە کوردییــەکاندا بــەکار هێــنراون. گــەلێ شاعیری تریشمان وەك: مەولەوی‌و پیرەمێردو کامەران، بۆ شــیعری کــورت و ئێســتاش زۆروکــەم جاروبــار، شــاعیرانمان، ئــەم کــارە ئەکــەن. لەراســـتیدا پەیڕەوکردنی ئەم پێشەکی نوســینانە، ئەگــەر بــۆ هــەندێ بابــەتی شــیعریی پێویست بکات، لە شیعری تازەی جیهاندا، بــەکارهێنانی زۆر کــەم بۆتــەوە، بە شێوەیەك کە شیعرەکە راستەوخۆو بروسکەئاسایی، دەست پێئــەکات، بــە کەمترین وشەو رستە، مەبەستەکان ئەوترێن.

٢ـ ئەوەی جێی ســەرنجە، ئــەم شــیعرە، ســەرومڕ سیمای رۆمانسیانەی پێوەدیــارە، کــە ئــەم ســیمایە، بــۆ شــیعری رەمــزی زۆر ناتــەبان. شــاعیرە رۆمانسییەکان کەمتر توخنی بابەتی رەمزیــی ئەکــەون و بــە پێچەوانەشــەوە شاعیرە رەمزییــەکان، لــە رۆمانســییەت دوور ئەکەونــەوە. ســوارە لەگــەلێ شیعری تریدا، ئەم توێژاڵی رۆمانسییە بەسەر شیعرەکانیا زاڵەو هەندێ جــار تارمایی‌و جێ پەنجەی شیعرە رۆمانسییەکانی مەولــەوی تــاوەگۆزی‌و هــەندێ جــاریتریش بــۆن و بەرامــەی دوو هاوینەگەشــتەکەی -گــۆران، لــە شــیعری سوارەدا هەست پێئەکرێ:

وەکو نــــەرمە هــــەنگاوی بــــــەرەوژووان
لەجێژووانی زیـــــندوو بەگیانی کچی جوان
وەکو گـــەرمەیـــــاوی قەشەی دەستی تاراو
لـــــەبزوێنی دەریـــــای بلوورینی بــــەروێ
بـــەخوڕ خۆبـــــە دیــواری کێوا ئـــەدا ئاو
لەگەڵ گاشەبەردا، سەر ئەسوێ، سەر ئەسوێ.

یان:

ئەڵێن تـــاجی زمڕوتی دوورگەی لەسەرناوە دەریا
هەتا چاو هەتەر ئەکا شەپۆلە، لەبوونا..لە چوونا

بــە ئاهەنگە ســــەربەندی بزوێنی خۆشی
لەبەر خۆرەتاوا ئەڵێی سینگی ژینە ئەهاژێ
ئەڵێی هــــانی هەســـتانە دەنگی خرۆشی

٣ـ بەڵام لە تەکنیکدا، لە مەولەوی و گۆران جیــاوازترە. مــەودای وشــە، رەت و بلاوە، لە پشــتی وشــەکانیەوە، چــەند دنیــاو مانــای‌تر هــەن. ئەمــە رەگەزێکی شیعری تازەیە، وشە لەو جێگایە گەورەترە کــە تیــایدا دائــەنرێ. لەم بارەیاندا قایل نــابێ ئــەوەندەی خــۆی بــێ. حــەز ئــەکات لــەو جێگایــە گەورەتر بێ کە تیایدا دانراوە. حــەز ئــەکات لەیــەك مانــاو زاراوە گــەورەتر بێ. بەڵکو چەند مانــا، یــان چــەند مەودایــەك لــە خۆیــدا کۆبکاتــەوە. بــە جۆرێك ئەگەر تێکڕای شــیعرێك لــەم بابەتــە بخوێنێتــەوە، هەســت ئەکــەیت تێکڕای شیعرەکە چەند مانایەکی هەیــەو هەمووشــیان جــوان و شــیاون. بــە پێچەوانــەی شــیعری مەولــەوی و گــۆران-ەوە، کــە وشــە هــەر مانــا فەرهەنگییەکەی هەیــە. بــا ســەیری ئــەم دوو وێنەیــەی مەولــەوی و گــۆران بکەین:

مەولەوی:

بۆی بالآت هەرزان وە دەشت و هەردان
ئەز رای لای تۆم وەکـــــام گوزەردان؟

گـــۆران:

قژکاڵی لــــێو ئاڵی پرشنگی نیگا کاڵ
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ

لای هەردووکیان وشە کوت ومت، هەر ئەو مانایە بــە دەســتەوە ئــەدات کە لە دێرەکاندا نوسراون. مانایــەکی تــر لــە پشــتیانەوە نییــە. کــەچی لای سوارە بەجۆرەیە:

بــــەڵێ، دوورە گــــەرمێنی دەریـــــــا
بــــەڵێ، وایە کانی هـــــــــــەژاران
ئەزانم، ئــــەوانی کە پــــاراوی ئاون، بژارن
ئەزانم، لەرێگا مەترسی گەلی ژەنگ و ژارن

٤ـ سەرەرای ئــەو توێژاڵــە رۆمانســیەش کــە بەســەر شــیعرەکەدا زاڵــە،

ئەبوایە ناوەرۆکی شیعرەکە لەوە روونتر بوایە کە چاوەروان ئەکریٚ. کەچی لە هەمان کاتدا جۆرەتەمێك بەسەر مانای شیعرەکەوەیە. واتا هەرچەندە شیعرەکە رۆمانسیە، بەلاّم ئەبیٚ زۆر لەسەر دێرەکان رابوەستیت و ورد ببیتەوە، ئەوسا دوای شیکردنەوەی دێرەکان، لەمانای شیعرەکە ئەگەیت. ئەجۆرە شیعرانە، لەو بابەتانەن کە زوو دەستەمۆ نابن، سرکن. ئەبیٚ ماندووت بکەن. رەنگە ئەم سرکییو دەستەمۆ نەبوونە، هۆی مانا فەلسەفیەکەی بێت، کە تێکڕای شیعرەکەی لە ئامێز گرتووە.

جیا لەم سەرنجانەش، ئەوەی جێی دڵخۆشییە، لەم شیعرەو ئەو چەند شیعرەی سوارە، کەمن دیومن، ئاسۆی بیری نەتەوایەتیو نیشتمانی سوارە، بەرینترە لە ئاسۆی تەسکی نەتەوایەتی ئەو شیعرە کوردییەی لە کوردستانی ئێراندا باوبووە. ئەم شیعرە بەڵگەیەکی گەورەی ئەو دڵخۆشیەیە، چونکە ئەو چۆمەی سوارە لەم شیعرەدا مەبەستێتی، نەتەوەی کوردە. بەلاّم ئەو چۆمە، چۆمیٚ تری وەك خۆی ناسیوەو لەگەڵی تێکەڵ بووەو بە تێکەڵ بوونیان روبارێکی گەورە دروست ئەکەن و بەرەو زەریا هەنگاو ئەنێن. کە قۆناغی دوایی زەریاکە، مەبەست لە هەموو مرۆڤایەتیە. ئەم بازدانە، بەسەر سنووری تەسك و داخراوی نەتەوایەتیداو پەڕینەوە بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ نەتەوەو گەلانی تردا، نەك هەر مرۆڤایەتی کورد دەرئەخا، بەڵکو حەقیقەتی مەسەلەی کورد ئەسەلمێنیٚ. بۆیە ئەمەی سوارە لەم شیعرەدا کردویەتی، جگە لە و سنوورشکاندنەش، راچەنینی شیعری نەتەوایەتی کوردییە، بۆ خۆناساندنی بەشیعری جیهانیو شانازیکردن بەوەوە کە نەتەوەی کوردیش چۆمێکی نەسرەوتەو ئەڕژێتە زەریای گەورەی مرۆڤایەتیەوە.

# =٣=
# ڕەفیق سابیر

سووتان لەبەر باران دا:

ڕەفیق، شاعیرێکە لەرێگای دوو دیوانەکەیەوە:
١ـ پشکۆکان ئەگەشێنەوە
٢ـ ڕێژنە

خۆی بە شیعرو خوێنەرانی کوردی ناساندووە. دەنگێکە دوای ساڵی ١٩٧٠، لەگەڵ کۆمەڵێکی تر لە هاوڕێکانی، سەریان هەڵداوە. بیرمە کە دیوانی یەکەمی چاپکرد، نامەیەکم بۆ نارد، تیایدا پیرۆزبایی، ئەوەم پێوتبوو کە لە دیوانەکەیدا، شیعرە تایبەتیەکانیم پێ جوان و خۆشن. ئەو شیعرانەی کە خودی ڕەفیق خۆیم تیا ئەبینی. ئێستاش هەمان قسە، لەمەڕ دیوانی دووەم و شیعرەکانی دوای ئەو دوو دیوانە ئەکەمەوە. چونکە من پێم وایە: پاکترین شیعر، ئەو شیعرانەن، کە شاعیر ڕاستگۆیانە، باسی خودی خۆی ئەکات.

ڕەفیق، شاعیرێکە، چەند تەجروبەیەك لە ژیانیا هەیە.ئەو تەجروبانەش کەم و زۆر کاریان لەشیعری کردووە. من لام وایە ئەو تەجروبانە چەند ئازاری دەرونی ڕەفیق -یان داوە، ئەوەندەش بۆ شیعرەکانی بوونەتە هەوێن.

لای ڕەفیق، بە کەمترین وشەـ مەبەستەکان ئەبن بە شیعر. لەبەر ئەوە شیعری ڕەفیق، پێشەکیو وردەکاری تیانیە. زۆر دەست ئەگرێ بە وشەوە. بە سڵ و ترسەوە وشە لە جێگەی خۆیدا بەکار ئەهێنێ. واتە: شوێن پێو هەنگاو، بۆ وشەکانی ئەدۆزێتەوە، ئەوسا دایانئەرێژێت. ئەم ئیقتیصاد کردنە، لەوشەدا، دیاردەیەکی تایبەتی نیە بە تەنیا ڕەفیق-ەوە، بەڵکو لای ئەنوەر قادر، زەقتر هەست پێئەکرێ. بەلام ئەوەی تایبەتە بە ڕەفیق، شێوازێکی جیاوازی خۆی هەیە. بەجۆرێك ئەوەی چەند شیعرێکی لەسەر یەك بخوێنێتەوە، هۆگری شیعری ئەبێت و شێوازی ئەناسێتەوە، کە ئەم ناسینەوەیەی شیعر، شتێکی ئاسان نیە. ئەمە ئەو ڕەگە ئەستوورەیە کە لە

زاراوەی ئەدەبیدا پێی ئەوترێ: دەنگی تایبەتی. ئەم تایبەتیو کەسایەتیە لەناو لێشاوی ئەو شەپۆلە شیعرەدا، کەدوای ساڵانی ١٩٧٠، سەری هەڵدا، شتێکە ئەنجامی خۆسەپاندنی شاعیرە، لەناو مەیدانی شیعرا. چونکە لێشاوی ئەو هەموو شاعیرەی دوای ساڵی ١٩٧٠ دەرکەوتن. ئەگەر زۆربەی شیعری شاعیرەکان تێکەڵ بکرایەو بە یەکەوە بخوێندرایەتەوە، هەمووی لەیەك ئەچوون، هەموویان جێپەنجەو کارتێکردنی یەکترییان پێوە دیاربوو. یان کورتتر بڵێم: هەموویان یەکتریان ئەجووەوە. بەلاّم وەك وتم شیعری رەفیق ئەناسرێتەوە. لەبەر ئەوەی بۆن و بەرامەو کەش و هەوای تایبەتی خۆی هەیە.

ئەم شیعرەشی: سووتان لەبەر باراندا - درێژبوونەوەی رێچکەی هونەریی شیعرەکانی پێشوتریێتی. هەموو گیانی شیعرەکە، تارمایی سووتان و مردن و خوێن و کوشتن و برینی پێوەدیارە. شیعرێکە رەنگدانەوەی بارودۆخی ئەم رۆژگارە سەختەی ئێستای پێوەیە، کە سیمای داپلۆسینی مرۆڤی کوردی پێوە دیارە:

لەنزیك دێ
گۆڕستانە خۆڵەمێشییەکەم لێ هەستایە سەرپێ
گۆڕەکان هێشتا، ناڵەی خوێنیان لێ هەڵدەستا

یان : بۆنی کفن و، بۆنی دیلییو
بۆنی پیاوە مۆمیاکانم لێ دوورخەوە

بەلاّم وێنەی ئەم داپلۆسینە، شیعر باس ئەکا، نەك بە قسە:

لەناو بولێڵی ئەم خامۆشیەدا
وەك گۆرانی سووری ژیان
بە باوەشێ ئەوینەوە
بباریێ ناو برینەوە
دەستم بگرە و بە هێمنیی
بمخە دەریای بەرینەوە

هەرچەندە داپلۆسینەکە، ئەوەندەی تۆزقاڵێك لە ورەو هەنگاوی ئەمی کەم نەکردۆتەوەو لەگەڵ خۆیدا ئەوە ئەڵێتەوە، کە هەرگیز نابەزێ:

هەتا هەتاوی تۆمان لێ هەڵدێ
لەرووی نەبوونا
لەرووی ونبوونا
پێ لەچەم دەنێین
پێ لە شەو دەنێین
پێ لە برین و ترس و تەم دەنێین
لەناو هالاوی ئەم کەنارەدا
خۆشەویستی تۆ، لەئامێز دەنێین

شیعر، لای رەفیق شیعرە. دوور لە کێش و سەرواو قالبی ئامادەکراو. هەندێ جار بەبێ پێڕەوکردنی هیچ یاسایەکی ئامادەکراو،راستەوخۆ شیعرەکە سنووری یاساکان ئەشکێنێ‌و دێتە دنیاوە. گوێ ناداتە کێش و سەرواو ترپە (ریتم)ی ناوەوەو دەرەوەی جەستەی شیعرەکە:

کەلە بنارەکە دوور کەوتمەوە
دوا ئامێزم لەچیا خوێناوییەکە توند کرد
بە پەنجە بێ‌نینۆکەکانم لەسەر بەردو خۆڵی
لوتکەو دامێنەکان
لەسەر بالأی برسێتی
لەسەر رەگی درەختەکان: نامەکەتم هەڵکۆڵی

لەم کۆپلەیەدا، ئەو دێرانەی سەرەوە هیچیان لەروی کێش-ەوە پەیوەندیان بە یەکترەوە نیە، هەر دێرەیان کێشێکی جیاوازە. بەلأم لە گەوهەردا هەست ئەکەی شیعر ئەخوێنیتەوە. چونکە شیعر، بە کێش و سەروا، نابێ‌بە شیعر، ئەگەر لە گەوهەردا گیانی شیعری تێدا نەبێ. لەبەر ئەوە چاکتر وایە پێش بیرکردنەوە لە: کێش و سەرواو یاسا پەیڕەوکراوەکان، بیر لەو ئاهەنگە شیعرییە بکەینەوە، کە شیعرەکە دروست ئەکات. هەرچەندە رەنگە هەندێ جار، ئاهەنگی جوانترین شیعر، شیعر دۆستێك نەجولێنێ.

من دڵنیام شیعری رەفیق بە زەوقی زۆر شیعر دۆست، ئاشنا نیە، بەلأم ئەوانەی راستگۆن، نکۆڵی لەوە ناکەن کە رەفیق شاعیرە. لێرەدا ئەبێ ئەوە

روون بکرێتەوە کە شێوازی رەفیق بە گوێچکەی هەستی ئەوانەی لەگەڵ کێش و سەروای شیعری ساڵی ١٩٧٠-ەوە راهاتوون زۆر تایبەتیو جیاوازە.
بەڵام نابێ ئەوە لەبیر بکرێ کە شیعری دوای ساڵی ١٩٧٠، هەمووی شیعر نین و زۆربەشیان تا ئێستا، یەك جۆر کێش ئەجوونەوە. جوونەوەیەکی ئاسان و دەق گرتوو، بە کێشی پەنجەو. جگە لە تەکنیکی تایبەتی رەفیق، کە جارێکی تر شاعیرێتی ئەسەلمێنێ بەڵام کە ئەڵێم رەفیق شاعیرە، مەبەستم لەوە نیە بڵێم: رەفیق هەموو تێنوێتیمان ئەشکێنێ، بەڵکو ئەڵێم ئەم شاعیرە داوا لێکراوە هەنگاویتر هەڵبنێ. هەنگاوێك ئەو دەقەی بە خۆیەوە گرتوویەتی، لێی راپەرێ. تەقینەوە لە خۆیدا دروست بکا. کۆمەڵێ مەرجی تازەگەریی شیعر هەن، کە رەفیق خۆی لێیان بێئاگا نییەو هێشتا شیعری رەفیق چاوەڕێیان ئەکات.
لەپاڵ ئەوەشدا، کەلای ئەم شاعیرە، وێنەی شیعریی دوور لە کێش و سەروا زۆرتر باوە، بەڵام هەندێ جاریتر، کێشێکی کوردیی ئاشنا بە هەست و گوێچکەی شیعرمان، بە سەروایەکی جوانی ناوەوەی شیعر، بەکار ئەهێنێ.

روم پێ لەم وەرزە بەردینە مەکە
ئەم مەشخەلانەی سەرم ناتوانم
لەم هەڵدێرەدا لقی دار نیە
کێلە بەردێکی تیژو هار نیە
بچەقێتە ناو قولایی گیانم

هەرچەندە وەك لە سەرەوە وتم: شیعر، بە کێش و سەروا نابێ بە شیعر. چونکە شیعریش وەك مرۆڤی ئەم سەردەمی دیلکردن و کۆت و پێوەندکردنە، وایە؛ حەز ئەکات راپەڕێ، یاخی بێت لەو یاساو سنوورانەی بۆی دانراوەو ملی پێکەچ ئەکەن کە بچێتە ژێری.
بەڵام ئەم راپەرینەش هەروا ئاسان نیە. (پاپلۆ بیکاسۆ)ش هەموو قوتابخانەو رێبازە هونەرییەکانی تاقیکردەوە، ئەوسا شتە تایبەتیو بەهرەی خۆی سەلماند. گۆران بە کێشەکانی شیعری عروزدا تێپەڕی، ئەوسا کێش-ە خۆماڵییەکانی سەپاند.

ئەو راپەڕینەیَ من مەبەستمە لە شیعردا، لای عەرەبەکان محمد ماغوط، ئەم کارەی بە جوانترین شێوە بۆ ئەنجامدراوە، لە هەموو شیعرێکیا، هەست ئەکەی شیعر ئەخوینێتەوە.

سەرباری ئەو سەرنجانەش دوا قسەم لەسەر ئەم شیعرە، چەند سەرنجێکی زمانەوانیە، لە سەر هەندیَ دێڕی شیعرەکە، وەك:

گۆڕەکان هێشتا
نالّەی خوێنیان لیَ هەلّدەستا

ئەوەی تائێستا سەبارەت بەراناو لەگەلّ وشەی خوێن دا، بەکار ئەهێنریَ، ئەوتریَ:

فلاّنە جێگا، بۆنی خوێنی لیَ دێت. من هێشتا نەمبیستوە بلّێن: نالّەی خوێن. یان:

دەشیَ لەم شەوانەدا
لافاوێکی ئەستوور هەستیَ

لەراستیدا، لافاو، یان: خوڕ، یان: گەورەو لەم بابەتانە بیستراون. نەبیستراوە: لافاوێکی ئەستور ئەو چەند سەرنجە وردەم، لە نرخی جوانیی شیعرەکە کەم ناکاتەوە. بەدلّنیاییەوە ئەلّێم ئەم شیعرەی، شیعری بڕوا بەخۆ بوون و بەرەنکابوونەوەی ئەو مۆتەکانەیە، کە سواری سنگی مرۆڤی ئەم سەردەمەو هەموو سەردەمێك بوون و ئەبن.

## ئامادەکرن و ساغ کردنەوەو
## پێشەکی نووسینی
## !؟

تێبینی:

سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ز - بنەماڵەی شاعیری ناسراوی کورد کەمالی (عەلی باپیر ئاغا)ی کۆچکردوو، روویان لێنام: کۆکردنەوەو ساغکردنەوەو رێکخستن و پێشەکی بۆ نووسینی، سەرجەمی دیوانی شیعری کەمالی، لە ئەستۆ بگرم. منیش پەسندم کردو بەرنامەیەکم بۆدانا. بەلاّم لەکاتی ئامادەکردنی دیوانەکەدا، لە لایەن رژێمی صدام- ەوە گیرام و دوو ساڵ زیندانی کرام. دوای ئازادکردنم دووبارە دەستم کردەوە بە تەواوکردنی کاری ئەو دیوانە. بەلاّم هەمدیسان شەوی ١٨/١٠/١٩٨٠ - نیوەشەوێك پیاوەکانی رژێمی صدام- بۆ گرتنم، وەك گوللە تۆپی ناوەخت رژانە حەوشەکەمانەوە. ئەمجارەیان هەرچۆنی بوو، بەرچنگیان نەکەوتم و دەرباز بووم.. تەواوکردنی دیوانی کەمالی - م لەگەڵ خۆمدا هەلگرت بۆ جێگەیەکی ئازادو هەرچۆنێ بوو دیوانەکە- م بە ئامادەکراوی دایەوە دەست بنەماڵەی شاعیر، تا رێگەی کاروباری بەچاپ گەیاندنی بۆ خۆش بکەن. ئیتر کە بیستمەوە دیوانەکە، رێگەی چاپخانەی گرتۆتەبەرو لەوێدا گیری خواردووە، کە سەربەرگەکەی ناوی منی وەك: نووسەری پێشەکیو ئامادەکار، لەسەرە. لەگەڵ بنەماڵەی ناوبراو رێککەوتین، کە ناوی منی لەسەر بسڕنەوەو ناوی بەرێز کەمال - ی کوڕە گەورەی شاعیری لەسەر بنووسرێ. پاش ئەمە، من لە جێگەیەکی تر بووم کە چاپیان کرد. بەمەش چاوم روون بۆوە.

ئێستا، کە بە خۆشیەوە دیوانی کەمالی چاپ بووە. لە هەندێ هاورێی نزیکم بەولاوە، کە لەسەرەتاوە ئاگاداری کارەکە بوون، خوێنەران ئەم راستیە نازانن. بۆیە بۆ: مێژوو، بۆ راستیی، ئەو پێشەکیەی کە بۆ دیوانی کەمالیی - م نوسیبوو، بە کەمێ دەست کارییەوە، ئەیگوێزمەوە بۆ دووتوێی ئەم کتێبە.

* * *

هێشتا کەمالی خۆی لە ژیاندا بووە، کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٦دا، یەکەمین کۆمەڵە شیعری، بەناوی دیاری شارەزور لە چاپداوە. ئەتوانم بڵێم ئەم دیوانە، زۆربەی شیعرەکانی کەمالی تیایە. کە ئەڵێم زۆربەی شیعرەکانی، مەبەستم لەوەیە: زۆربەی ئەو شیعرانەی کە کەمالی‌ی پێ ناسراوەو لە هەرەت و گوڕی شاعیرێتیدا نووسیوێتی. دوای ئەم دیوانە، لەساڵی ١٩٦٨دا دووەمین دیوانی، بەناوی باخی میرەوە لە چاپداوە. شیعرەکانی ئەم دیوانەیان، وەك تەمەنی شیعر، دوای شیعرەکانی یەکەمین دیوانی نووسراون. جگە لەوەی کەشیعری وەرگێڕاوی زۆرتر تێدایە وەك لە شیعری خۆی.

دوای ئەم دوو دیوانەش، ساڵی ١٩٧٢، بەنیازی لەچاپدانی سێیەمین دیوانی، کۆمەڵێك شیعری تری، بەناوی پێش مەرگم -ەوە کۆکردەوەو کاروباری رەقابەشی جێبەجێ کردبوو، بەلاَم مەرگ مەودای نەداو ئەم ئاواتەی بەچاو نەدی.

ئەوەی پێویستە لەرووی ساغکردنەوەی شیعرو رێنووسەوە، سەبارەت بەم ٣ دیوانە بوترێ، جگە لە دیوانی یەکەمیان: دیاری شارەزور، بەو هۆیەوە کە مامۆستام کاکەی فەللاح شارەزای شیعری کلاسیکی کوردیو دۆستی نزیکی کەمالی بووە، دیوانی ناوبراوی بە پوختی چاودێری کردووەو تارادەیەك، ئەو دیوانەی لەچاو ئەوانی‌تریدا، رێك و پێك ترە. چونکە کەمالی کاتێ خولیای لەچاپدانی شیعرەکانی خۆی کەوتۆتە سەرەوە، تەمەنی پیرێتی‌و کەم هێزیی چاوی، یارمەتی ئەوەیان نەداوە خۆی شیعرەکانی خۆی بنوسێتەوەو بۆ چاپیان ئامادە بکات. بۆیە ئەوانەی دوو دیوانی دواییان ئامادەکردووە، کەمتر شارەزای دنیای شیعری کەمالی و شیعری کلاسیکی کوردی بوون. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی، سەرەڕای هەڵەی رێنووس و نووسینەوەی شیعرەکان، لەهەمان کاتیشدا ئاگاداری ئەوەش نەبوون کەلە هەر یەکێ لەو دوو دیوانەی دواییدا، هەندێ شیعریان نووسیوە، لەهەر سێ دیوانەکەدا هەیە. هەروەها ئەوەشیان بیرچووە، کە ئەم شیعرە چەندجار دووبارەکراوانە، وەك یەك بنووسن. واتە ئەم دوو دیوانە، شیعری وایان تێدایە هەر شیعرێکە، بەلاَم لەهەر دیوانێکدا لەویتر جیاوازە.

لەئامادەکردنی ئەم دیوانەدا، ویستم ئەو جیاوازییانە لە پەراوێزدا دەستنیشان بکەم، بەلاَم کەزانیم ئەم کارە جێگە زۆر ئەگرێ، وازم لێهێنا. بۆیە بۆ کۆکردنەوەو

ئامادەکردنی ئەم دیوانە، بەتەواوی پشتم بەو دیوانــە ئامادەکراوانــە نەبەسـتووە. بەڵکو کەوتمە پشکنینی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی پێش ساڵانی ١٩٥٠ کــە کـەمالی شیعری تیا بڵاوکردوونەتەوە. لەوبڕوایەوە کە ئەو شیعرانە، کاتی خۆی کەمالی، بــە هەموو هۆش و گۆشی خۆیەوە خۆی بۆ بڵاوکردنــەوەی نــاردوون. پــاش گــەڕانێکی وردو پشوو درێژو بەراوردکردنی ئەو شیعرە بڵاوکراوانە، لەگەڵ شــیعرەکانی نــاو ٣ دیوانی ناوبراودا، نائومێد نەبووم و ئەم دیوانەم ئامادە کرد.

هەنگاوی دواتر

لەبەر چەند هۆیەك واتای شیعرو لێکۆڵینەوەم لــە پــەراوێزدا لەســەر شیعرەکان نەنووسی:

١- ئەم دیوانە، دیوانی شاعیرێکی کلاسیکە،کەسێکیش بیەوێ لــە شــاعیرێکی کلاسیك بگات، ئەبێ هیچ نەبێ هەندێ زانیاری لە شیعری کلاســیکی هــەبێ، بــە تایبەتی کە کتێبخانە کوردی هەندێ نمونەی بــەنرخی وەك دیوانــی نــالیو مــەحوی تیایە، کــە ئەگــەر هــەمان شت لەگــەڵ هــەموو شــاعیرێکی کلاسـیکی دووبــارە بکرێتەوە، ئەبێت بەشــتێکی دووبــارەکراوو ســواو. جگــە لەمــەش ئــەوەی لەســەر شاعیرێکی وە ك نالی ئەنووسرێ، پێویستترە وەك لــەوەی لەســەر شــاعیرێکی دوای ساڵی ١٩٠٠ ئەنووسرێ، چونکە ئەو خوێندەوارەی لە لایەنەکانی شیعری کلاسیکی کوردی پێش ١٩٠٠گەیشتبێ، کلیلی کردنەوەی تێگەیشتنی شاعیرەکانی دوای ئەو مێژووەشی پێ ئەبێ.

٢- بەرای من، کەمالی لەرووی شیعرەوە، لەچاو شاعیرە کلاسیکیەکانی پێــش خۆیدا، جۆرە ڕوونییو ڕەوان -ییــەکی بێگــرێو کراوەتــری تیایــە، کــەمتر ڕەمــزو خواستەمەنیو جینــاس و طیبــاق و داخســتن و وشــەئارایی کــردووە. لەبــەر ئــەوە ئەگەرچی کەمالی وەك شاعیرێکی کلاسیکی هاتووە، بەڵام تێگەیشتن لە کــەمالی، ئاسانترە وەك لە تێگەیشتنی نالیو مەحویو..بۆیە لەم ڕووەوە لە پەراوێزدا بەچاکم نەزانیوە واتای شیعرەکان لێك بدەمەوە.

جگە لە شیعرەکانی ناو ئەم دیوانەی بەردەستتان، هەندێ شیعری تری هەیە، لە بۆنەی تایبــەتیدا کــە پــەیوەندییان بــە بزووتنــەوەی سەربەســتیخوازانەی کــوردەوە هەبووە، وتراون، وەك نمونەی ئەم شیعرە کەلە ل٢ی ژمــارە ٨ی ڕۆژنامــەی بــانگی کوردستان-دا، بڵاوکراوەتەوە. لەگەڵیدا ئەم ڕوونکردنەوەیەشی بۆ نووسیوە.

بەموناسەبەتی ئەوەوە، کە جەنابی جەلالەت مەئاب، رەئیسی میللی کوردستان، شێخ عبدالقادر ئەفەندی نیشانێکی هیلال و ئەستێرەی لە ئالتون دروستکردووەو لەسەر هیلالەکە عیبارەی -فیدای میللەت - هەڵکەندراوەو بە بازووی موبارەکیدا گرتوە، ئەم چەند شیعرە بێژراوە:

فیدات بم ئەی فیدایی میللەت ئەی سەرداری کوردستان
وەلی عەهدی هومایۆن تالعی خونکاری کوردستان
بە ئەنفاسی مەسیح ئاسا عیلاجی عاجلبت بەخشی
بە دایەی بێکەسی بێچارەیی بیماری کوردستان
وەکو بارانی رەحمەت لوتفی عامت فەیز بەخشانە
بژی ئەی واسیتەی نەشئونەمای گولزاری کوردستان
بەزەرکفتی تەلا ناوت لەمەولا دەرج ئەبێ تا حەشر
لە تەئریخا بە عینوانی سوپاسالاری کوردستان
ئەگەر بیشم کوژن زومرەی موخالیف پێت ئەڵێم ئەمجا
هیزەبری غالیب، ئیبنی حەیدەری کەراری کوردستان
ئەوەی بەدخواهتە با قوڕ بەسەرداکا بە نەومیدی
وجودی تۆیە فەخری فیرقەیی ئەحراری کوردستان
دەخیلم فرسەتە هەنگامی سەعیو جوهدە تێکۆشە
بەدڵ بۆ ئینتزامی موڵك و بۆ ئیعماری کوردستان

لەپاڵ ئەمجۆرە شیعرانەشدا وتاری ئەدەبیو سیاسیو بیرەوەری خۆی، لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا هەیە، کە لێرەدا وەك نمونە، ئاماژە بە هەندێکیان ئەکەین:

١- جگە لەو پەندو ئامۆژگارییانەی لە رۆژنامەی بانگی کوردستاندا بڵاوی کردوونەتەوە، هەندێ وتاری ئەدەبیشی لەهەمان رۆژنامەدا، بەنیازی بووژاندنەوەی ئەدەبی کلاسیکیمان نوسیووە،وەك ئەو وتارەی بەناونیشانی: ئەدەبیاتی کورد-لە ل٢ی ژمارە٧ی ئەم رۆژنامەیەدا، تیایدا دوای باسکردنی گرنگی پێدانی ئەدەبی کورد، ئەرکی لە چاپدانی دیوانی شاعیرە پێشینەکانی خۆی: ئەحمەدی خانی، نالی، کوردی، سالم، حاجی قادری کۆیی، حەریق، شێخ رەزای تالەباتی، خالص، مەولەوی، وەفایی - لەئەستۆ گرتووە.

ئەبێ لێرەدا ئەوەبووترێ کە کەمالی، لەژێر سێبەری حوکمداریێتی شێخ

مەحمودی نەمردا، ئەم پرۆژەیە ئەخاتە ئەستۆی خۆیو تا پریشکی ئەو حوکمداریە لەئارادا بووە، دیوانی مەحوی بە چاپ گەیاندووە..بەلاّم کە پرشنگی ئەو حوکمداریە کوژێنراوەتەوە، ئومێدی پرۆژەکەی کەمالیش نەهاتۆتە دی..هەرچەندە بە هەمان تاسەوە، لەساڵی ١٩٣٩دا، کتێبێکی بەناوی گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەسرم چاپکردووە، کە جگە لە نمونەی شیعری خۆیو پوختەیەك لە ژیانی خۆی، نمونەی بەرهەمی: ئەحمەد موختار، ئە ثیری، بێخود، پیرەمێرد، حەمدی مەلا حەمدون، تایەربەگ، گۆران، زێوەر، مەحوی، موفتی پێنجوێنی، میرزا مارف، شێخ نوری، ناطیق، سەلام، رەمزی مەلا مارف، قانع، رەفیق حیلمی، عەبدوللا حەسەن، ناری، بێکەس، عورفی، شوکری فەزلی، ئەمین زەکی، رەشید نەجیب، عبدوالواحد نوری - تێدایە.

٢- هەندێ لەسەر وتارەکانی رۆژنامەی بانگی کوردستان-ی نووسیوە. تیایاندا زۆر بابەتی گرنگ و رووداوی زیندووی ئەو سەردەمەی بە مەبەستی وریاکردنەوەی گەلی کورد نووسیوە.

٣- ساڵی ١٩٦٠ - لەژمارە ٧ی گۆڤاری رۆژی نوێدا، دەربارەی رۆژانی شێخ مەحمودی نەمر، چەند دێرێکی بەنرخی هەیە.

٤- ساڵی ١٩٧٣دا، کتێبێکی بەناوی: شاعیرە ناو ون بووەکانی کورد -ی بلاّوکردۆتەوە. تیایدا ژیان و نمونەی بەرهەمی ٤١ شاعیری نووسیوە.

٥- لەرووی وەرگێرانیشەوە، ئەم کتێبانەی لەزمانی فارسیەوە، بە شیعر کردووە بەکوردی: شیرین و خوسرەو، ئەمیر ئەرسەلان، خورشیدو خاوەر، شەڕی خەیبەر، گیانی سەعدی.

### کەمالی ی مرۆڤ:

کەمالی - نازناوی شیعرێتیو خۆی ناوی عەلیە. لەبەر خۆشەویستی کەمال-ی کوڕە گەورەکەی خۆی، ناوی خۆی ناوە: کەمالی.

• ساڵی ١٨٨٦، لەشاری سلێمانی لەدایك بووە. کوری باپیر ئاغای کوڕی چراغ-ە، کە یەکێك بووە لەسەرانی هۆزی سمایل عوزەیریو لەتیرەی -میر ئالایی-یە. باپیر ئاغای باوکی، لە سوپای عوسمانیدا: ئەفسەر بووە. کەمالی لەتەمەنی ٤ ساڵیدا بووە، کە باوکی کۆچی دوایی کردووە.

وەك نەریتی ئەوسای کوردەواری، هەر بە منالی خراوەتە بەر خوێندنی ئایینیو

لە مزگەوتی شێخ عەبدوڵڵا، کەبە مزگەوتی دوودەرگا-و لەسەر شەقامی نالی-یە، لە سلێمانی، دەستی بەخوێندن کردووە. پاش ئەوەی خوێندنی کتێبە ئایینیەکان تەواو ئەکا. درێژە بەو جۆرە ژیانە نادات و بەناوی کاتب ئەبێتە فەرمانبەرو بۆ ئەم ئیشە، بۆ بەغدا گوێزراوەتەوە. پاش ماوەیەکی کورت گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانیو لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لەنێوان ساڵانی ١٩١٣ تا ١٩١٧دا، کراوە بە سەربازو لە سلێمانی هێشتوویانەتەوە. لەدوای ساڵی ١٩١٩، کە ئینگلیزەکان بە تەواوی عێراقیان گرت، کرا بە قایمقام -ی چەمچەماڵ. بەلاّم ماوەیەکی کەم لەم ئیشەدا مایەوە. چونکە دوای ئەم مێژووە ئیتر کەمالی تێکەڵ دنیای ڕاپەرینی ڕووناکبیریو بزووتنەوەی سەربەستیخوازانەی کورد بووە. بە تایبەتی لە بزووتنەوەکانی شێخ مەحمودی نەمردا. لەم ڕووەوە، شاعیر، لە بیرەوەری خۆیدا، هیچی بۆ تۆمار نەکردوین. هەرچەندە بۆ زیندوکردنەوەو هاندانی ئەم گیانەی، دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسول، لە ژمارەیەکی گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ دا، ئەڵێ:

... چەند ساڵێك پێش مەرگی، چوینە لای، باسی چیم دی ئەحمەد خواجە-و ڕۆژانی شێخی نەمرکرا، داوامان لێکرد ئەویش یادگاری خۆی بنووسێتەوە. زۆرتر خۆی لە مەسەلەکە لائەدا. لای وابوو نابێ ڕەخنە لە شێخ بگیرێو نابێ هەموو ڕاستیەکیش بەلای گەشییو کەم و کووڕیەوە نەلێت. دوایی بڕیاربوو یەکێ لە ئامۆزاکانم بچێت لای دابنیشێت و چی وت، بینووسێتەوە. چەند جارێ چووبوو، هیچی لێدەسگیر نەببوو.

بەلاّم لەگەرمەی ئەو ساڵانەداو، لەسەرەتای ١٩٢٢ەوە، لەگەڵ زۆربەی ڕووناکبیرانی ئەوسەردەمەی شاری سلێمانیدا مشتومڕو گفتوگۆیان لەسەر ئەوەبوو، کاتی ئەوە هاتووە: کۆمەڵێك، ڕێکخراوێك، پارتێك، بەمەبەستی گوڕدان بەباری ڕووناکبیریو بزووتنەوەی سەربەستیخوازانەی کورد بدەن. لەم بوارەدا تەقەللایان گەیوەتە پێکهێنانی کۆمەڵەیەکی ڕوناکبیری؛ کە ئامانجەکانی ئەم کۆمەڵەیە، لەڕێگەی ڕۆژنامەیەکەوە، بەجەماوەری کوردستان بگەیەنن. ئەم کۆمەڵەیەیان ناونا: جەمعیەتی کوردستان و ئەو ڕۆژنامەیەش، کەئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێ، ناونرا: ڕۆژنامەی بانگی کوردستان.

خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری مستەفا پاشا یامولکیو دەستەی نووسەرانیشی: شێخ نوری شێخ ساڵح و ڕەفیق حیلمیو کەمالی بوون. کەمالی

لەم رۆژنامەیەدا گەلیٚ وردە وتارو شیعری بلاٌوکردۆتەوە، کە زۆربەیان بریتـی بـوون لە هاندان و وریاکردنەوەی گەلی کوردو پشتگیریکردنی حکومەتی شـێخ مـەحمود. بەواتا: کەمالی هەموو گیان و قەلەم و بیروهۆشی، تـەرخانی مەسـەلەیەکی پـیرۆز کردووە.

ئـەوەی شـایانی باسـە، ئـەم رۆژنامەیـە، دوای پێکـهێنانی حوکمـداری شـێخ مەحمودی نەمر، بوو بەزمانی حالّی حوکمدارییەکەو بەتێکچوونی حوکمدارییەکـەو داگیرکردنی سلێمانی،لەلایەن ئینگلیزەکانـەوە، ئـەمانیش وازیـان لـە رۆژنامەکـە هێناوە.

هەرلەم ماوەیەدا، لەسەر خواست و فرمانی شێخ، وەك لە دیوانی بـاخی مـیردا نووسراوە، لای حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیز، بووە بە نووسەر، کە ئـەو سـەردەمە، بەرودوا، لە سلێمانی بوون، وەك: سۆن، گرین هاوس، ئەدمۆندز. دوای ئەم ماوەیە، لەسالّی ١٩٢٤ تا ١٩٢٦ کراوە بە فەرمانبەری دارایی لە هەلّەبجە. بەلاٌم کە شـێخ و لەشکرەکەی چونەتە ئێران، کەمالیش دەستی لە ئیشەکەی هـەلّگرتووەو خـۆی گەیاندۆتە لایان. ماوەی سالیٚ لای ماوەتـەوە. لـەو ماوەیـەدا لەسـەر راسـپاردەی شێخ، دووجار چۆتە تاران و کرماشان بۆ دیدەنیکردنـی رەزاشـاو هـەندیٚ بـالّیۆزی هەندەران لە ئێران و گەیاندنی نامە بەناوبانگەکـەی شـێخ-ی نـەمر، بـۆ کۆمـاری شۆرەوەی.

لەسالّی ١٩٢٨دا، گەراوەتەوە هەلّەبجەو تاسالّی ١٩٥٠ لەویٚ نیشـتەجیٚ بـووە. ئەمجارەیان لەبەر ئەوەی کەمال-ی کوڕە گەورەیَ بە مووچەخۆری میری لە کەرکوك، دامـەزراوە، چۆتـە ئـەویٚو تاسـالّی ١٩٦٣ لـەویٚ ماوەتـەوە. لەوەبـەدواوە، بـۆ ئێجگاریی گەڕاوەتەوە سلێمانی.

پاش بەسەربردنی تەمەنێکی ٨٨ سـالّیی، لەشـەوی ١٩٧٤/١١/٢٩دا، کۆچـی دوایی ئەکات و لەگردی شێخ محیدین لە سلێمانی، ئەنێژریٚ.

هێشتا لە ژیانیشیدا بووە، کە یـەکێتی نووسـەرانی کـورد - لقـی سـلێمانی، کۆڕێکی ریزلێنانی، لە هۆلّی یانەی فەرمانبەران، بۆ کەمالیو رەمزی مەلا مـارف و ئیسماعیل حەقی شاوەیس، سازکرد. دوای مەرگیش، هەر: یـەکێتی نووسـەرانی کورد/ لقی سلێمانی - کۆڕێکی فراوانی ماتەمی بۆگێڕا.

## کەمالی ی شاعیر:

ئەگەر قوتابخانە شیعرییە کلاسیکیەکەی سەردەمی کۆتـایی میرنشـینی بابـان، چەند کەڵە شاعیرێکی تێـدا هەڵکـەوتبێ، بـێ سـێودوو، کـەمالی یەکێکـە لـەو شاعیرانە.

کـەمالی جگـە لـەوەی وەك شـاعیرێکی دوا چـۆری ئـەم قوتابخانـە شـیعرییە: حەمدی، ناری، بێخود، تاکۆتایی ژیانی هەر پەیڕەوی ئەو جۆرە شـیعرەی کـردووە، سەرباری ئەمەش، شـیعری کـوردی لەسـەر دەسـتی کـەمالیدا، جـۆرە رەوونیـیو کردنەوەیـەکی بێگـرێو گۆڵـی بەسـەردا هـاتووە. چونکـه هـەر شـاعیرە هاوسەردەمەکانی کەمالی گرانترو سەختتر دێنە بەر هەسـت و بیسـتن. واتـە: هـەر خوێندەوارێکی شیعری کلاسیکی، شیعری کـەمالی پێئاسـانترە، وەك لـە شـیعری یەکێکی وەکو: بێخود -ی هاوسەردەمی کەمالی.

لێرەدا: وەفایی، مافێکی رەوای خۆیەتی، ئەگەر پێی بووترێ: یەکـەم کەسـێك، پێش کەمالی- یش ئەم رچەیەی شکاندبێ: وەفایی بووە. وەفایی، لـەم مەیدانـەدا، زۆر وەستایانە، زا ڵ وسوارەو بە دڵنیاییەوە ئەتوانرێ بە شـیعری وەفـایی بووتـرێ: **سَهْل مُمْتَنِعْ**. هەرچەندە ئەم جیاکردنەوانە، لەنێوان ئەم شاعیرانەدا، هەر تەنیا ئـەم لایەنە ناگرێتەوە، بەڵکو هەریەکە لەم شاعیرانە، جۆرە کەسایەتی تایبـەتیو بـۆن و بەرامەی خۆیان هەیە. بۆیە هەر بەو جۆرەش، لە چەندان لایەنی ترەوە سـەربەخۆن. بۆنمونە: ئەو یەکێتی بابەت و گیانە نیمچە رۆمانتکیەی لای حەمدی ئەبینرێ، لای کەمالی نیە. یان ئەو هەموو خواستەمەنیەی لای بێخود هەیە، لای کەمالی-نیـە. هەر بەو جۆرەش، ئەو روونییو رەوانیەی لای کەمالی - هەیە، لای ئەوان نیە.

کەواتـە سـەرباری ئـەوەش کـە کـەمالی شـاعیرێکی قوتابخانـەی کلاسـیکی سەردەمی بابانە، لە پاڵیشیا شاعیرێکی دەنگ و رەنـگ جیـاوازو بـۆن و بەرامـە سەربەخۆیە. لای کەمالی، کەمتر یەکێتی بابەت بـەدی ئـەکرێ، لەهـەموو کێشـە کورت و درێژەکانی ئەمجۆرە شیعرەدا، شیعری هەیەو لە هـەموویاندا سـەرکەوتووە. لەکۆتایی ژیانیشیا، جگە لەو کێشانە، بە کێشـی خۆمـاڵیش شـیعری زۆر هەیـە. زۆرکـەم لاسـایی شـاعیری تـری کردۆتـەوە. تاقیکردنـەوەی شـاعیرێتی کـەمالی تاقیکردنەوەی کەمالی خۆیەتی؛ چونکە لە ژیانیا، شیعر، هەموو شتێ بووە. بۆیـە بە هەموو دڵنیاییەوە کەمالی شیعری کەمالیانەی نووسـیوە. بـەلای خۆیـەوە لـەو

روانگەیەوە کە خۆی ناسیووەو لەخۆی گەیشتووە کە ئـەتوانێ شـیعری سـەرکەوتوو بنووسێ، لەدوا دواییەکانی ژیانیا، کە پیریێتی پەکی خوێندنەوەی خستبووو شـیعری زۆر لاوازی نووسیوە. شیعرێك لە شیعرە پلە نزمەکانی شیعری میللی. لـەم رووەوە ئەوەی وێنەیەکی شیعری سالّی ١٩٣٠ی کەمالی بخوێنێتـەوەو بـازێك بـۆ شـیعری دوای سالانی ١٩٦٠ بەدواوە بدا، بڕوا ناکات ئەو دوو شیعرە، هی شـاعیرێك بـن. کەواتە کەمالی شیعری لاوازیشی هەیە. جگە لە شـیعری لاواز، ئـەوەی بـە وردی شیعرەکانی کەمالی بخوێنێتـەوە، تێئـەگات کـە ئـەم شـاعیرە، فەرهـەنگی وشـەو خواستەمەنیەکی سنووورداری هەیـە. لـەم سـنووورەدا زۆرجـار وێنـە شـیعرییەکانی خۆی، لە شیعریتریدا دووبارە کردۆتەوە.

کەمالی لە رێگەی شـیعرەکانیەوە، ئـەوە بـە خـەلکی ئـەلێ کـە لـە شـیعری کوردیدا، شوێن رچەو شوێن پیێ ولاتی شیعری مەحویو سالم و نـاریو حـەمدی - گرتووە:

لـــــەریزی شاعیرانا، بـــــۆیە من ئەمڕۆ سەرئەفرازم
لەشاگردانی بەزمی حـــــەزرەتی (مەحوی) شەکەررازم
لەپاش مەحوی ، هەمیشە پەیرەوی (سالم) ئـەکەم، لاکین
بەدلْ زۆر عاشقی هەلْبـــــەستی (ناری) نیکتە پەردازم

هەربۆ دەستنیشانکردنی جێگەی خۆی، ئەلێ:

پەیڕەوی (حەمدی) ئـەکەم، دائیم (کەمالی)، بۆیەوا
ویردی خاص و عامە، ئەشعاری تەرەب ئەفزایی من

بـەلام مـن پڕکێشـیی ئەکـەم و ئـەلێم: ئەگـەر کـەمالی، لای خـۆی ئەمـــەی سەلماندبێ، کەچی شیعرەکانی بەو رادەیەی کەمالی ئەیەوێ، ئەوە ناگەیەنن، بەلکو بە پێچەوانەوە، من ئەوەندەی جیێپەنجەو رەنگدانەوەی شـیعری نـالی، لـە شـیعری کەمالیدا ئەبینم، ئەوەندە زەبرو کارتێکردنی سالم و مەحویو حەمدیو ناری لەسەر نیيە. بۆ بەلگە با ئەم چەند وێنەیەی کـەمالی بنووسـین، کەئەگـەر کـوت ومـت، شیعری نالی نەبن، ئەوا شیعری نالی-ن و کەمالییانە دارێژراونەتەوە:

١- لەدلْما چی ئەکەیت، پڕ ئاگری عیشقە دەخیلت بم
وەر ســــەرچاوەکەی چاوم، کە جێگەی باسەفاهێکە
٢- بێرە ســــەرچاوم سەفاگاهێکی خۆشە گیانەکەم

چی ئــــــەکەیت، هەروای لەناو کلپەو بلێسەی سینەما؟

با ئەم وێنانە بەرامبەر بەم وێنەیەی نالی رابگرین:

تۆ، کەحۆریت، وەرە نێو جـــــەننەتی دیدەم، چ دەکەی

لـــەم دڵەی پڕ شـــەرەرو سینـــەیی ســــــۆزانمدا

هەروەها ئەم وێنانەی:

١- نـــــایخەمە سەرکاغەز، ئەسلاً، تاکو ماوم چاوەکەم

نـــاوی تــــۆ دەوران نەکـا با قەت لەدەم نامەحرەما

٢- گەر لە بالآی نـــــامەدا ناوت نـــەنووسم، زویر مەبە

خۆت ئـــەزانی دووزمــــانە، خـــامە زۆر نامەحرەمە

٣- قەڵـــــــەم بێگانەیە ناوت نەهێنم زویر مەبە توخودا

رەقیب ئـــــاسا، کە چونـــکە هەر خەریکی دووزبانی بوو

بەرامبەر بەم وێنەیەی (نالی)ن:

کەی دەکـــات شــــەرح و بەیاناتی رمووزی دەردی دڵ

روورەشی هـــــــەروەك دەوات و دووزمانی وەك قەڵەم

هەروەها ئەم وێنانەی:

١- بـــــــۆ من کــە گەدای کۆیی نیگارم بە حەقیقەت

ســـایە سەری زولفی لـەســـەرم، بـــــالّی هومایە

٢- ئەکەم تەخسیری مولکی هیند ئەگەر ئەو دولبەرە رۆژێ

بخاتە سەر سەرم وەك سێبەری بـــــــالّی هوما، پەرچەم

بەرامبەر بەم وێنەیەی (نالی)ن:

نـــێلی کە غـــولامی مـــەدەدی زولف و بـــــــــرۆتە

شــــاهێکە لەبن ســـــــایەیی بالّی دوو هومادا

هەروەها ئەم وێنەیەی:

وتم: خۆ تیــــــلە چاوت، پێکەنی فەرمووی: برۆ شێتە

تەرازووی نـــــازی مەحبووبان ئەبێ هەر ئەمسەرو سەربێ

بەرامبەر بەم وێنەیەی (نالی)یە:

پێم دەڵێن: مەحبووبە خێل و قیچە مەیــــــلی شەڕدەکا

خێل و قیچه یاتەرازووی نازی نەختێ سەردەکا؟

وەك وتم لەم بەڵگە هێنانەوەیە، تەنیا مەبەست لەوەبوو، کە زەبرو ڕەنگدانەوەو جێپەنجەی نالی زۆرتر لەسەرە، وەك لەوەی کەمالی خۆی باس ئەکات، نەك خوانەخواستە کەم کردنەوەی دەسەڵاتی شاعیرێتیو زەبرو ڕەنگدانەوەو جێپەنجەی: سالم و مەحویو حەمدیو ناری، لەسەر شیعرو ئەدەبی کوردی، چونکە هەریەکە لەوانە، لووتکەیەکی جیاوازو سەربڵندی خۆیەتیو دنیای ئەدەب و شارستانێتی کوردیان دەوڵەمەند کردووە. بەڵام ئەم کارتێکردنەی نالی، وەك وتم، هەرچەند بێ، ئەنجامەکەی لای کەمالی، بەوە شکاوەتەوە، کە کەمالی لە ئیشەکەدا، خۆی ئاسایی ڕەفتاری کردووەو بۆن و بەرامەی سەلیقەی شیعری کردووە بە هەوێنی ئەو شیعرانە.

بێجگە لە ئەو جێپەنجەیەی نال-ی، بەسەر شیعری کەمال-یەوە؛ کە نالی، وەك دیاردەیەکی زۆر زەق و ئاشکرا، لای هەموو شاعیرانی دوای خۆی، ئەم ڕەنگدانەوەیەی هەیە؛ تاك و تەرای بەیتەکانی کەمال-ی، هەندێ جێپەنجەی بێخودو ناریو مەحوی یشی پێوەیە. بۆ ئەمەیان ئەڵێم: ئەو دیاردەییەی کارتێکردنە سەریەکتریە، نەك هەر لای کەمالی هەیە، بەڵکو لە نێوان هەموو شاعیرانی سەر بەیەك قوتابخانەی شیعریی هەیە، لە هەموو دنیادا، بەڵام مەسەلەکە لێرەدا پەیوەندی بە چەندێتی ئەو کارتێکردن و ڕەنگدانەوەیە هەیە. جگە لەمانەش ئەگەر سەرژمێرێکی گشتی لایەنی شیعری کەمالی بکەین، زۆربەیان شیعری دڵداریو جوانین؛ شیعری هەستی گریاوی کەمالی - ن بەرامبەر بەو کڵپەو سەودا هەمیشەییەی بۆ عەشق و روخساری جوان هەیبوە. شیعری دۆش دامان و چۆکدادانە لەبەردەم هەموو جوانییەکی مرۆڤ و سروشتدا، شیعری ژیانێکی قەلەندەرایەتیو سەرهەڵگرتنە لەدنیای پارەپەرستیو ڕیاییو چەوساندنەوەی مرۆڤ.

کەمالی، هەرگیز لەپشتی شیعرەوە، چاوەڕوانی خەڵاتی بەرامبەرو دەستگیرۆیی کەسی نەکردووە. هەر هەندە شیعرانەش کە لە بۆنەو لەسەر خواستی خەڵك وتوونی، لەپشتی وتنەکەوە، قازانجێکی مادیو تایبەتی تیا نەبووە. تەنیا قەناعەتێکی کەمالی بوون، بەرامبەر بەو بۆنەو شتە جوانانەی لەو کەسەدا بوون.

شیعری بۆ بەختەوەری مرۆڤی کورد وتووە. مرۆڤی کوردی هانداوە نیشتمانی

خۆی خۆش بوێت و پشت نەکاتە بەرژەوەندی گەل. بۆیە کەمالی پێش هەموو شتێك شاعیرێکە، لە بەرەی گەلە. لای کەمالی هەموو شتێك لە پشتی گەلەوە، رسوایی‌و خۆدۆڕاندن و سەرشۆڕییە. بەڵام ئەگەر ئەم لایەنەی کەمالی، وەکو دیاردەییەك، بەزەقیی لە شیعرەکانیا، لەچاو یەکێکی وەکو حەمدیدا، کەمتر ببینرێ، ئەوا سەرتاپای هەڵوێستی کەمالی، ئەوە ئەگەیەنێ کە هەموو تەمەنی خۆی لە پێناوی بەختەوەریی نەتەوەکەیدا بەسەر بردووە. لەهەر شوێنێ ترووسکەیەکی بۆ چارەنووسی کورد بەدی کردبێ، شوێنی کەوتووەو بۆی ماندوو بووە. دیارترین ترووسکەیەك کە کەمالی زۆر بۆی پەرۆش بووە، تروسکەبزووتنەوەکانی شێخ مەحمود بووە. چونکە دڵنیا بووە لەوەی ئەو بزووتنەوەیە، سەرەڕای هەموو ئەو وردە شتانەی کە دوژمنانی بزووتنەوەکە، لە پاڵیا نوقورچی پێ لە شێخ ئەگرن و هەمیشە پاشقول و پیلانیان ئاراستەی ئەو تروسکەیە کردووە؛ کەمالیی بە پشوویەکی درێژو ورەیەکی بەرزو چاوێکی تیژەوە، دڵنیا بووە لە پاکێتی‌و دڵسۆزیی شێخ و بەجۆرێ پشتگیری کردووە، کە دوای مەرگی شێخ-یش رەخنەی لێنەگرتووە. لەتەنگانەو خۆشیدا پشتی بەرنەداوە. چونکە زانیوێتی کوژانەوەی ئەو تروسکەیە، کلۆڵیی‌و پەرێشانی گەلی لەدواوەیە.
لەم مەیدانەدا دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول، لەهەمان ژمارەی گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا ئەڵێ:( هەرچی هەڵوێستی پیاوانی وەك کەمالی‌و ئەحمەد موختارو رەفیق حیلمی-یە، هەڵوێستی پیاوی نیشتمان پەروەری هەست بە مەسئولیەت کەری ئەوتۆیە، کە بۆ چاکەی گەل و نیشتمان، چاویان لە هەموو ئازارو باری تایبەتی خۆیان پۆشیوەو لەگوڵ ناسکتریان بە شێخ نەوتووە..).
ئەمەی کەمالی لەم رووەوە کردوویەتی، جێی شانازی ئەدەبی کوردییە، کە سەرتاپای ژیانی‌یە خۆی‌و ئەدەبەکەی، لەپێناوی خزمەتگوزاریی‌و بەرژەوەندی گەلدا بووە.

## سەرنج:

ئەم نووسینە ، لەدووتوێی نووسینێکی درێژتردا بووەکە لە شێوەی نامیلکەیەکدا ئامادەیچاپم کردبوو، بە ناونیشانی (دواسەفەری نالی بۆ دەرەوەی کوردستان)و تیایدا هەوڵی ساغکردنەوەی ئەو دوا سەفەرەی (نالی)م دابوو، کەبۆ دواجارو ئێجگاریی کوردستانی جێهێشت و ئیتر جارێکیتر کوردستانی باشوری نەدییەوەو لە ئاوارەییدا، سەری نایەوە.

ئەم نامیلکەیە، برایانی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (نووسەری کوردستان)، کە یەکێتی نووسەرانی کوردستان، لە شاخ چاپ و بلاۆمان دەکردەوە؛ چاویان پێ کەوتبوو بە تایبەتی برایانی شاعیر: کاك رەفیق سابیرو کاك هەڤال کوێستانی.

ئەم بەشەش لەو نامیلکەیە، لە ژمارە(٤)ی گۆڤاری نووسەری کوردستان- بەهاری ساڵی ١٩٨٢ چاپ و بلاۆبۆتەوە. بەلاّم سەرومڕی نامیلکەی ناوبراو، لە هێرشی کیمیاویباران و بۆردومانی هێزەکانی صدام بۆ سەر ناوچە ئازادکراوەکانی دۆڵی جافەتیو بناری چیای ئاسۆس-دا، لەگەڵ دەیان نووسین و شیعری تری بلاۆنەکراوەمدا، لەناوچوون.

# شیعرێک لەنێوان نالی و کوردیدا

-محەمەد حەمە باقی-

رەفیقان من ئـــــەوا رۆییم لەلاتان
لە مەزلوومان بلاّ چۆلّ بێ ولاّتتان

حەوت(٧) بەیتی ئەم شیعرە؛ تا چاپکردنی دیوانی (نالی) لەلایەن مامۆستایان: مەلا عبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم و محەمەدی مەلا کـەریم-ەوە، لای زۆربەی شیعردۆستانی شیعری کلاسیکی، بە شیعری ((مستەفابەگی کـوردی)) دەزانرا..دکتۆر مارف خەزنەدار-یش لەدیوانی (نـالیو فەرهـەنگی نـالی)یەکـەیدا خۆی لەم شیعرە بوواردووەو کەم و زۆر بۆرە ئاماژەیەکیشـی بـۆ نـەکردووە. دیـارە جەنابیشیان پێیوایە شیعرەکە، شـیعری مسـتەفا بـەگی کـوردی-یـە. مامۆسـتا سەعید ناکام-یش هەر ئەم شیعرە، بە شیعری نـالی دەزانـێ..بـەلاّم مامۆسـتایان مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی، لەبەر رۆشنایی ئەو کۆمەڵە تێکست و دەستنووسانەی لایانەو لەپاڵ روونکردنەوەیەکیان نووسیوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

ئەم پارچە شیعرە، لەزۆربەی دەستنووسەکانی بەردەستماندا دراوەتە پاڵ نـالی.. جیاوازیی ئەم (٧) بەیتەو (١٣) بەیتەکەی ناو دیوانی (کوردی)؛ هەندێ ئـالۆگۆڕی زنجیرەو ژمارەی بەیتەکانە..بێجگە لەوەش کە بەیتی یەکەمی هەردووپارچەکـە لـە دیوانی کوردیدا، ((عەزیزان))و لای ئێمە ((رەفیقان))ە..بەیتی یەکەم و سـێیەم و چوارەم و پێنجەم و حەوتەمی ئەم (٧) بەیتە، لەو شیعرە (١٣) بەیتییـەدا هەیـە، کەبەناوی کوردی-یەوە؟ لەدیوانی کوردیدا چاپکراوە..)(دیوان -ل٣١٧).

پێشەکی دەبێ ئەوەمان لەیاد بێت؛ کـە ئێمـەی کـورد، لەبەرئـەوەی ئەرشـیفی ئەدەبیی نووسراومان لەو چەند دەستنووسە کۆن و تێکستە کەمە تێپەڕ ناکات؛ کە بە رێنووسی عەرەبیو خەتی فارسی، لە هەندێ کـون و قوژبـن و بـاوولّ دا بۆمـان ماوەتەوەو تا ئێستاش ئەم ئەرشیفە هەژارو پەرپووتەمان چۆن هاتبێتە بەردەسـت، هەروا بەبێ توێژینەوەو بژارکـردن، یەکسـەر وەرمـان گرتـووەو تێکسـتەکەی چـۆن بووبێت، لای ئێمەش هەروا بێسێودوو، رۆیشتووە.

بەڕای من، ئەمە کارێکی پێچەوانەی ڕێبازی زانست و ساغکردنەوەی زانستییانەیە..بۆ وێنە: تا ئێستا ئەو دیوانگەلە شیعرانەی لە لایەن مامۆستا (گیو موکریانی)یەوە چاپکراون، زۆربەی شیعری شاعیرەکان، تێکەڵ و پێکەڵ کراون..شیعری ئەم دراوەتە پاڵ ئەو؛ ئەو دراوەتە پاڵ ئەم..هەربەم جۆرەش هەندێ نووسیاری لەمەوبەرمان، وەك ئەم مامۆستایەیان کردووەو دەستنووس و تێکستە جێماوەکانی ئەوانیش، شتێکە لەم بابەتەو پێویستە لەسەر هەر دەستنووسێك، چەندان جار چاوی بژارو جیاکردنەوەیان پێدا بگێڕدرێتەوە..بۆ ئەوەی شیعری شاعیرێك، بەزۆرەملێ‌و بەبێ بەڵگەو سەلماندن؛ بەسەر شاعیرێکی تردا نەسەپێت..یان جیاکردنەوەی شیعری جوان، جوان و هەڵبژاردەی شاعیرێکی ترو لکاندنی بە شاعیرێکی ترەوە (لەبەر هەر مەبەستێك بێت)، ڕوو نەدات..

بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش پێویستە ئەوە بزانین کە هەموو شاعیرێك، لەسنوورێکی دیاریکراودا، کۆمەڵێك واژەو وێنەو شێوەی داڕشتن و سنعەتسازیی خۆی هەیەو..ئەو فەرهەنگەی شاعیرێك بەکاری دەهێنێ، لەزۆر ڕووەوە زۆرجیاوازترە لە فەرهەنگی واژەی شاعیرێکی تر.. ئەو تەکنینك و کەسایەتی‌و تایبەتمەندییەی شاعیرێك هەیەتی؛ گەلێ جیاوازترە لە جێپەنجەو سنعەتسازیی‌و تایبەتمەندیی شاعیرێکی‌تر..کە ئەنجام وا هەست پێدەکرێ شاعیرەکە دنیایەکی تایبەتی‌و بۆن و بەرامەیەکی سەربەخۆی دەبێ..یان بە واتەیەکی‌تر، وەك مامۆستا (مەسعود محەمەد) دەڵێ: ((ناسینەوەی شیعری شاعیر؛ بۆ زەوقی شیعردۆست، تارادەیەك وەك ناسینەوەی دەنگی گۆرانیبێژە)). ئەمە لەکاتێکدا کە شاعیرەکە دەنگی تایبەتی‌و شێوازی تایبەتی خۆی هەبێت؛ بەتایبەتی بۆ یەکێکی وەکو (نالی)، کە ئێمە لەڕووی ئەم شیعرەوە مەبەستمانە.

سەبارەت بەم شیعرەش؛ پێش ئەوەی ئەم چەند بەیتەش بەناوی نالی-یەوە چاپ بکرێت، دەمێکە پێم وایە سەرتاپای ئەم شیعرە هی نالی-یە؛ چونکە ئەوەی نالی‌دۆست بێت، دەزانێت سنعەتسازیی‌و جێپەنجەی هونەری شیعری (نالی)، بەزەقی بەم شیعرەوە دیارە. واتە: بۆن و بەرامەو کەش و هەوای (نالی) هاوار دەکات.. تەکنیکی شیعر، لای (نالی)، وەك تەکنیکی زۆر شتی سروشتیی‌وایە، چونکە ژانی لەدایکبوونی شیعر لای (نالی)، ئەوەندە سروشتیی‌و بێ درێژە؛ کە هاتوونەتە دنیاوەو چاویان هەڵهێناوە، هیچ سیماو نیشانەیەکی لەباربردن و زۆر

لەخۆکردنیان پێوە نابینرێت؛ بە جۆرێک وەک (کیتس) دەڵێت: وەک چرۆکردنی گەڵای درەخت وان؛ چۆن لەوەرزی چرۆکردندا، بەکاوەخۆ چرۆ دەکەن، سەردەردەهێنن..شیعریش لای (نالی)، ئاوا لە وەرزی خۆیاندا، دوای دەم کێشان؛ دوای پیشان، دوای بژارو ئارایشتێکی هەناسەدرێژو سەلیقەیەکی بەرز، لەدایك بوون..

زۆرجار کە لە شیعرێکی (نالی) ورد دەبمەوە، وا هەست دەکەم شیعرەکە هەر لە بنەڕەتدا خۆڕسکەو دەستی مرۆڤی نەگەیشتوتێ.. وەك چۆن درەختێك، بەبێ ئەوەی کەس نەخشەی چۆنێتی لق و پۆپ دەرکردنی کێشابێت؛ یان چۆن شێوەی هەڵکەوتن و دروستبوونی چیای (پیرەمەگروون)و (هەندرێن)، هەر لە سروشتدا وان و ئەگەر دەستکاری بکرێن، یان ئاڵوگۆر بە جێگاکانیان بکرێت، یەکسەر پێیانەوە دیارە؛ شیعری نالی-یشم وا دێتە بەرچاو، کە ئەگەر دەستکاری هەندێ واژەو جێگاگۆڕکێیان پێبکرێت، بنچینەو سروشتی بەیتەکە، وەك ئەو شوێنانەی لێدێت؛ کە بوومەلەرزە کاولیان دەکات.. یان وەك (ئەدۆنیس) واتەنی: وەك ئەو پایانەیان لێدێت کە ئەگەر خشتێکیان لێ دەربهێنرێت، سەرتاپای پایەکە دەڕووخێت..بە پێچەوانەی شیعری ترەوە کە گەلێك جار ئاڵ و گۆرکردنی واژەیەك، یان لێدەرهێنانی واژەیەکیان، هیچ لە تەکنیك و مۆسیقاو واتای شیعرەکە ناگۆڕێت..ئەوەی شارەزای شیعری نالیبێت، دەزانێت شیعری (نالی) گەنجینەیەکە؛ هەر بەیتێکی، هەر واژەیەکی چەندان وردەکاریو مەودای ماناو مەجازییو وێنەی ئاخنراوی تێدایە..رێدەکەوێت لە تاکە بەیتێکی (نالی)دا، چەندان وێنەی جیاو تێکەڵی تێدا بێت..بە جۆرێك دەبێتە جێی رامان و حەپەسان، کە چۆن ئەم شاعیرە، ئەم هەموو وردەکارییو سنعەتسازییو وێنە زۆرەی لەتەنیا بەیتێکدا کۆکردۆتەوە..ئەوەندەی شیعری (نالی)، لای خوێنەر، جێی وردبوونەوەو لەنگەرگرتنە؛ شیعری هیچ شاعیرێکی ترمان وانییە..بۆیە بەناو دنیای شیعری (نالی)دا تێپەڕ دەبم، دەڵێی بەسواری ئۆتۆمبیلێکی خێرا، بەناو شارێکی زۆر جوان دا تێپەڕ دەبم.. ئالەو شارە جوانەی (نالی)دا، هەموو شتەکان جیاوازو تایبەتن..هیچ شتێکی ئەم شارە، لەهیچ شتێکی شارێکی تر ناچێت..دەشێ شارەکانیتر چاویان لەم کردبێت و جێپەنجەو نیشانەی ئەمیان پێوە دیار بێت..بەلام شارەکەی ئەم: (نالی)، رەنگڕێژو دەستکردو پەرداخەی خۆیەتی..کەواتە

چۆن ئەوەی رووباری (سیروان)و چیای (پیرەمەگروون)ی دیبێت، ئیتر شێوەیانی لێ ون نابێت و لەنزیك و دوورەوە دەیانناسێتەوە؛ ئاوا شیعری (نالی)یش ئەم سروشتە خۆرسکەی هەیە؛ هەر لە دوورەوە دەناسرێتەوە.

با ئێستا لەگەڵ تەواوی شیعرەکەدا بژین، بۆ ئەوەی بزانین دەتوانین هەندێ جیاوازیو بەراوردکاریی، لای (نالی)و (کوردی) دەستنیشان بکەین!:

رەفیقـان من ئەوا رۆییم لەلاتـان
لەمەزڵوومان بلاّ چۆڵ بێ ولاّتتـان
بلاّ سا شار بەشـارو دێ بەدێ بین
لەدەست یـاران بکەیـن تەیی ولاّتان
مەڵێن کەڵکی نـەبوو، رۆیی جەهەننەم
سەرم قەڵغـانە بۆ تیری قەزاتان
کە من رۆییم، جەهەننەم پڕ مەکەن لێم
لەمن خاڵی مـەکەن کۆشك و سەراتان
کە ئێوەن پادشـای لوتف و عەدالەت
بەخودا حەیفـە بڕەنجێنن گەداتـان
ئـەگەرچی (خاك و خۆڵ)ە رەهگوزارم
بەسەرمـا خۆ گوزەر نـاکا سەباتان
جەفاتان دام وکوژتمتـان بـەزاری
نزوولی رەحمەتە جـەورو جەفـاتان
وەرە بنوارە چـاوی پڕ لە خوێنم
بە تەفصیـلات ببینن ماجەراتـان
ئیـلاهی من ببم رۆژی دووسـەدجار
بـەقوربـانی گەداو پادشـاتان
نەسـیمی کۆیتۆ، خاتر دەکا جەم
بە بۆی گورەی پـەشێوی پـانیاتان
منم سـەرکردەتان بۆ لەشکری خەم
دەتـرسم من برۆم، بشکێ سوپاتان
شکاری وەحشییـان بەس دەستەمۆکەن

نـــــەوەك بـــــەربێ شــــــكاری خانەزاتان
ئەگەر سەر بوو، ئەگەر دڵ بـــوو، ئەگەر ڕۆح
هـــــەموو ڕۆیین؛ چییــــــــە ئیتر تەماتان؟
سەفەرمان چونکە ڕێی هـــــــات و نەهاتە
دوعامـــــــان بۆ بکەن، ئـــێوەو خوداتـــــان
ئەوەندە ئەرجوو دەکــــــا (نالی)؛ کە جارجار
بکەن یـــــــادی موحیببی بێ ریــــــــاتان
بــــــا ئەم چەند بەیتە بەســـــەر بکەینەوە:
ڕەفیقـــــــان من ئەوا ڕۆییم لــــــــەلاتان
لە مـــــــــــــەزلوومان بلا چۆڵ بێ ولاتتان
بلا ســـــــا شاربەشـــــارو دێبــــــەدێ بین
لەدەســـــــت یـــــاران بکەین ئەبێ ولاتان

من سەرتاپای ئەو هەردوو دیوانــەی (مســتەفا بـەگی کـوردی)م پشـکنی؛ کـە مامۆستایان: (کوردیو مەریوانی)و (گیو موکریانی) چاپیان کردووە؛ واژەی (بـلا)ن کە بەمانای: (لێی گەڕێ، قەیناکە، باوابێ)یە، تیایاندا نەبوو. ئەگەرچیش (نـالی)و (کوردی) لەرووی فەرهەنگی واژەوە لە یەکتر نزیکن؛ کەچی ئەم واژەیەو ئـەم چـەند وشەیەی دوایی؛ کە لەهەندێ بەیتی تری ئەم شـیعرەدا باسـیان دەکـەین، هـەر بـە تەنیا (نالی) لە چەند جێگەی تری دیوانەکەیدا بـەکاری هێنـاون، وەك ئـەم چـەند نموونانەی لەم بەیتانەدا هەن:

١- چونکە نەتکرد قوڕ بەسەریا، تاوەکو تەسکین ببێ
مەیدەرە بەر پێلەقە، توخوا (بلا) بگری بەتاو (دیوان - ل ٣٦٦)

٢- (بلا) بۆ کوندەبوو بێ، مفتی مشك و ماری کەندوو بێ
خەطیرەی گەنجی وێرانە، زەخیرەی کونجی کاشانە (دیوان - ل٤٨٣)

٣- گەهێ ئاهو ڕەوش شاهی، گەهێ گەوهەر مەنیش ماهی
(بلا) با سینە سەحرابێ، (بلا) با دیدە دەریابێ (دیوان - ل٦٠٢)

٤- ئەگەر تەکیە، ئەگەر شێخە، هەموو داوی عەلایق بوون
(بلا) نالی بچێ مەستی خەرابات و موجەڕەد بێ (دیوان - ل٦٣٢)

یان وشەی (بنواڕە)، کە لەم بەیتەدا هەیە:

وەرە (بنوارِە) چاوی پڕ لەخوێنم
بە تەفصیلات ببینن ماجەراتان

کە ئەم واژەی (بنوارِە)یەی، لەم چەند بەیتەدا بەمجۆرە دووبارە کردۆتەوە:

١ـ وا ظه ن مەبە روخسارەیی تۆ، غائیبە قوربان
(بنوارِە) چلۆن نەقشە، لەنێو دیدەیی تەڕما (دیوان - ل١٢١)

٢ـ (بنوارِە) بوونی ئەووەڵت و چوونی ئاخرت
هاتی چ رووت و قووت، هەلاتی چ لووس و پووس؟ (دیوان - ل٢٣٩)

٣ ـ گەر ئاب و تابی جەننەتی بۆ دۆخیت دەوێ
(بنوارِە) نێوچەوانی بەشووش و برۆی عەبووس (دیوان - ل٢٤٠)

٤ - وەرە (بنوارِە) دوو دەستی حەناییم
حەنایی چی؟ هەموو هەر خوێنە قوربان (دیوان - ل٣١٥)

٥ ـ ئەی شەمسی مایەپەروەرو ئیکسیری خاك
(بنوارِە) حاڵی هالیکی ئەم خاکە ئەحقەرە (دیوان - ل٤٣١)

٦ - (بنوارە) وشکەسۆفیو رەقسی بەهەلهەلە
دیسان لەبەحری وشکی هەوا، کەوتە پیٚمەلە (دیوان - ل٤٦٧)

٧ ـ (بنوارە): سروشکی من، کە لێلاۆوە، غوباری کوه و هاموونە
وەرە سەرچاوەکەم (بنوارە)، وەك ئاوێنە، چەند روونە (دیوان - ل٥٣٠)

٨ ـ (بنوارە) نەوبەهارو فتوحاتی گوڵشەنی
گوڵ زاری کردەوە، لەدەمی، خونچە پێکەنی (دیوان - ل٦٢٢)

٩ ـ (بنوارە) خوشیی رەقسی لەگەڵ خەرقەیی ئەزرەق
مومکین نییە بەم پاکییە، لەم ئەرزە، سەمابێ

هەروەها واژەی (طورِە)؛ کە لەم بەیتەدا هەیە:

نەسیمی کۆی تۆ، خاتر دەکا جەم
بە بۆی طورەی پـــەشێوی پانیاتان

(نالی) لەم چەند جێگایەی تردا، ئەم واژەیە بەمجۆرە بەکار دەهێنێ:

١ ـ تاتایی سەری (طورەیی) پڕ پێچشی بادا
هەر تایەکی بارێکی گوڵ و ئافە بەبادا (دیوان - ل٨٣)

٢ ـ (طورِەت) وەکو تۆماری شکستەو سەری کوڵمت

بۆ نووری سەوادم بووەتە شەمعی موتالا (دیوان - ل١١٦)

٣ ـ شایستەی شان، لایقی، مل ، (**طورەیی**) تۆیە

نەك (**طورەیی**) شاهەنشەهی‌و تەوقی وەزارەت (دیوان - ل١٤٥)

٤ ـ بۆ مەشقی عەشقی زولْفی نیگارو نیگارشی

نالی لەخامەدا بووەتە شاهی (**طورەنووس**) (دیوان - ل٢٤٠)

٥ ـ وەك (**طورەیی**) پێچیدەیی تۆ؛ ساغ و شکستەم

وەك نەرگسی نادیدەیی تۆ، خۆش و نەخۆشم (دیوان - ل٢٨١)

٦ ـ سەوادی ئەو، ئیشتیهای سەهوی جوان

بەیازی (**طورەیی**) ئەم، ئینتیباهی سوجدەیی پیر (دیوان - ل٢٠٦)

٧ ـ لەشەوقی رووی شەمع و زولْفی دوودو (**طورەیی**) مەحجەر

سوپەندو عوودو پەروانە، بخوورو غالیبە سووتن (دیوان - ل٣٢٩)

٨ ـ بە (**طورە**) وەك پەڕی تاوس، بە گەردەن ئاهوون؛ یەعنی

لەسەر ئاهوویی گەردەن، هەردوو حەلقەی داوە زولْفەینی(دیوان - ل٦٧٧)

٩- رەیاحین پەرچەم و لالە کولاّه و یاسەمین (طورە)

بە نەخشە خالْ و، نەرگس چاوو گولْ زارو سەمەن ساقە (دیوان - ل٤٥٥)

١٠- لەدنیا جەننەتی باقی تەلاری شاهییە، ساقی

حەبیبە (**طورەیی**) تەوقی ملی (شیرین)و (عەزرا)یە (دیوان - ل٥٦٩)

دیسان واژەی (دەستەمۆ)، کە لەم بەیتەدا هەیە:

شکاری وەحشییان بەس (دەستەمۆ)کەن

نەوەك بەربێ شکاری خانەزاتان

لەم بەیتەشدا دووبارەی کردۆتەوە:

لێم حەرامە دانەو ئاوی حەماماتی حەرەم

من کەبازی دیدە بازم، نەك شەوارەی (دەستەمۆ)م (دیوان - ل٣٠١)

یان کە لە بەیتی دواییدا دەڵێ:

ئەوەندە ئەرجوو دەکا (نالی)، کە جارجار

بکەن یادی موحیبی بێ ریاتان

واژەی (ریا)، کە (نالی) سەرکەش و سەربڵندە، زۆر رقی لێی بووە؛ لەگەڵێك جێگەی تری دیوانەکەیدا بە قێزو بێزەوە بەکاری دەهێنێ. ئەمە نیشانە گەورەکەی

(نالی)یە، کە هەمیشە سەربەرزو نەفس بەرز بووەو هەرگیز چاوشۆڕی کەس نەبووە، کە (ریایی) لەبەردەمدا بکات؛ بۆیە لەچەند شیعرێکی تریدا واژەی (ریا) بەم شێوانە بەکار دەهێنێ:

١ـ خاتری زاهیدی خاڵی، خاڵی
نییە ئەڵبەتە لە بێنێکی (ریا) (دیوان - ل١٢١)

٢ ـ ریشەکەی پان و درێژە، بۆ (ریا) خزمەت دەکا
زاهیرە هەرکەس بە گوول و عەرضی ریشیدا (ریا) (دیوان - ل١٢٨)

٣ ـ خۆشترە عوزری گونەهکاران لەسەد زیکری (ریا)
ئەم بە نەرمیی عەفوە عەفوە، ئەو بە توندی عەف عەفە (دیوان - ل٤٥٢)

٤ ـ سۆفی (ریا)یە خەڵوەتی، بێنی بەهاری کرد
هاتە دەرێ لە سایەی چایەر، حەسایەوە (دیوان - ل٥٥٤)

٥ ـ نالی کە ویقاری نییە، بێباکە لە خەڵقی
سۆفی کە سلوکێکی هەیە، عوجب و (ریا)یە (دیوان - ل٥٦٥)

٦ ـ بە (ریا) باری تەکالیفی رسوومی بۆ خەڵق
چ دەکێشێ؟ ئەمە حومقێکە، عەلاوەی کەرییە (دیوان - ل٥٨٦)

بەلاّم واژەی (ریا) ، هەر لەم تاکە بەیتەی (کوردی)دا هەیە:

مەکەن مەنعم لە ئاهوو ناڵە، (کوردی)
سەبووری خۆی (ریا)کارانە، ئەمشەو

یان (نالی)، کە دەڵێ:

منم سەرکردەتان بۆ لەشکری خەم
دەترسم من برۆم، بشکێ سوپاتان

ئەم واژە لێکدراوانەی وەك: (لەشکری خەم)، کە بەدوو واژە، ئەم وێنە سەیرە دروست دەکات؛ شتێکە هەر ئیشی (نالی)یە..ئەم ئیشانەی (نالی)، من وام دێتە بەرچاو، کە دوو تەلی کارەبا: ساردو گەرم، لێکدەدات و ئەنجام کلّپەیەك، برووسکەیەك، ئاگرێك، رووناکیەك..بەدەستەوە دەدات. بەلاّم لای (نالی)، ئەم لێکدانی دوو واژەیە، ئەم وێنە شیعرییانە دروست دەکات.

با بۆ وێنەی تری لەم بابەتەی (نالی)، چەند شیعرێکی تری بگرین؛ کە هەمان سنعەتسازییان تێدایە:

١ ـ تیرەکەی ئەو ڕۆژە، مەحبووبەم لوتفی کرد بەمن
گەر نەبەخشیٚ مەرهەمی وەسلی، برینم کارییە (دیوان - ل٥٨٣)

دەشیٚ لەهەموو دەرمانخانەیەکدا جۆرەها مەرهەم چنگ بکەویٚت..بەلاٚم لە هیچ دەرمانخانەیەکدا (مەرهەمی وەسل) نییە..کەچی لە حەقیقەتیشدا (مەرهەمی وەسلٚ) هەیە..(مەرهەمی وەسلٚ)، لای عاشق، ئەو دیدەنیو سەردانە پیرۆزەیە، کە دلٚدار، سەر لە دلٚدارە پیٚکراوەکەی خۆی دەدات..دیارە دلٚدارە پیٚکراوەکە، ئەو دیدەنیو سەردان و (وەسلٚ)ە، بۆی دەبیٚ بە دەرمان و مەرهەمیٚکی کاریگەر، کە زامەکانی سارێژ دەکات.

قەسەم بەو شەربەتی دیداری پاکت
شەرابم عەینی ژەهری مارە بیٚتۆ (دیوان - ل٣٨٢)

لیٚرەشدا (شەربەتی دیدار)، جۆریٚکە لە ویٚنەیەکی پیٚشووتر.. دیداری دلٚدار ئەوەندە شیرینە، هەموو شەربەتیٚکی تر لە ئاستیدا تالٚە؛ بۆیە ئەگەر وەك شتی (ماددی)، شەربەتی - دیدار، لای دلٚدار نەبیٚت، ئەوا شەربەتی دیدار، ئەو روخسارە خاویٚنەی دلٚدارە؛ کە شەربەت و هەنگوین و شەکریٚکی رۆحیی، دەڕژیٚنیٚتە گیانەوە.. ئەو گیانەی، ژیان پڕی کردووە لە تالاٚو..لەکاتی دیدەنیدا پڕ دەبیٚ لە شیرینی..

یان

دەورانییە، وەك هیٚلٚەکی سەودا، سەری گیٚژم
بۆیە بە دەقیقی مەثەلە، هەرچی دەبیٚژم (دیوان - ل٢٧٦)

ئیٚمە هەموومان بەو شتە دەلٚیٚین (هیٚلٚەك)، کە (کەمە)یەکی جوغزداری هەیەو ژیٚرەکەی بەتۆری کون ورد، یان ژیی وردو چنراو، دروستکراوە. کەچی لیٚرەدا (هیٚلٚەك)، سەری (نالی) خۆیەتی! بەلاٚم کەللە سەریٚکی پڕ جۆش و خرۆش و ئاهەنگی سووتانی عەشقیٚکی گەورە.. ئەو هیٚلٚەکەی سەری (نالی)، هیٚلٚەکیٚکی سەودایە..ئینجا ورد ببنەوە؛ هیٚلٚەك خۆی لەکاتی بەکارهیٚنان و کارپیٚکردندا، دەجوولیٚو دەخولیٚتەوە..سەرباری ئەوەش ئەو هیٚلٚەکە، عاشق بیٚت! ئەوە ئەو هیٚلٚەکە سەودایە دەردەچیٚ، کە سەلیقەی (نالی) وای لیٚدەکات هەرچی ببیٚژیٚ؛ لە پەندو وتەی بە قەوارە بچووك و بەمانا گەورەی لیٚ پیٚك دیٚت.

یان:

لەحەسرەت سەرووی قەدت، چاوی نالی

دوو جۆگە، بەڵکو دوو رووبـــــارە بێتۆ (دیوان - ل٣٨٤)

ئەم واژەی (سەروو)ە، لەگەڵ واژەی (قەد)دا، لێکدەدرێن؛ (سەرووی قەد)یـان لێ پێکدێت،کە تێکرا وێنەی بالآیەکی بەرزو رێکی دلدارەکەی (نالی)مان دێنێتە پێش چاو.

ئەگەر بـۆ وێنـەی تـری رەم بابەتـەی (نـالی) بگـەڕێین؛ کـە ئـەم جووتـە واژە لێکدراوانەی وەك(لەشکری خـەم، مەرهـەمی وەسـڵ، شـەربەتی دیـدار، هێلـەکی سەودا، سەرووی قەد)یان لێ پێکهاتووە؛ وێنەی تر لە دیوانی (نالی)دا زۆرە.

بەلام وابزانم ئەو چەند وێنەیە، تینوێتی ئەم مەبەستەمان دەشکێنێ..

هەروەها ئەم بەیتەی:

ئەوەندە ئەرجوو دەکا (نالی)، کە جارجار

بکەن یـــــادی موحیبی بێ ریـــــاتان

چەند نزیکە هەر لەم بەیتەی (نالی) خۆی:

رەنگی زەردو سووری خەوف و خەجلەتی، ئاوی حەیای

وا تکاو ئەرجوو دەکەن عەفووی بکات وەك عەبدی خۆی (دیوان - ل٦٩٢)

ئەم بەیتانە وا .. دیسان هەر بەیتێکی تری ئەم شیعرە، کە دەلێ:

ئەگەرچی (خاك و خۆل)ە، رەهگوزارم

بەســــــەرما خۆ گوزەر ناکا سەباتان

یەکســـەرو دەم و دەســت ئـەوەمان بـیر دێتـــەوە، کـــە (نـــالی) وەك هـــەموو واژەسازییەکی، واتە: خۆی ئاسایی، ئەگەر لەواژەی (خاك وخۆل)، چەند مانایـــەکی مەبەست بووبێت، ئەوا (یـــەکێك) لـەو مانایانـە، ئـەو گونـدی (خـاك و خـۆل)ەی مەبەستە؛ کە خۆی تیایدا هاتۆتە دنیاوە؛ کـــە ئەمـــە هیـــچ گومـــانێك ناهێڵێتـــەوە لەوەی کە لەم بەیتەدا دەلێ: جێ نزرگـەو هەوارگـەو هـاتووچۆم، هـەر بـۆ (خـاك وخۆل)ە..ئەو (خاك و خۆل)ەی کە هەمیشە لە بیرەوەری (نالی)دا زیندوو بووەو لـــە نزیك و دوورەوە، بـــە حەســـرەتی دیدەنییـــەوە بـــووە.. ئـەوەتا لـــە (شـــام)ەوە؛ لـەو قەسیدەیەدا، کە بۆ (سالم)ی شاعیرو هاورێی نووسیوە، هەر (خاك و خۆل) دەژی:

داخل نەبی بە عـەنبەری سارایی (خاك و خۆل)

هەتا نەکەی بەخاکی (سولەیمانی) یا عوبوور (دیوان - ل١٨١)

یان لەم شیعرەی تریدا؛ کە دیارە هەر لە درەوەی کوردستان نووسیوێتی:

تری عینه الابدان م (خاك وخۆڵ)ە

تری منزل الاوراق من توزو گردە (دیوان - ل٤٠٣)

جگە لەمانەش، کاکڵەی شیعرەکە، بە کتێبێکی بابەتیی یەکگرتووی تێدایە؛ کە ئەم دیاردەییە لە زۆربەی شیعرەکانی (نالی)دا بەرچاومان دەکەوێو کەمتر لە شیعری (کوردی)دا دەبینرێ.

سەرباری هەموو ئەمانەش، ئەوەندەی ئێمە(نالی) دەناسین؛ زۆرتر وەك شاعیرێکی ئاوارەو دەربەدەرو سەرهەڵگرتوو دەیناسین؛ کە ئەم شیعرە، ئەو سیما گەورە پڕ سەفەرو کۆچە رۆحییو هەمیشەییەی تێدایە.

کەواتە ئەم بەڵگانە بەسن بۆ ئەوەی بڵێین: ئەم شیعرە لە بنەڕەتدا هەر شیعری (نالی)یە..جیا لەمانەش لەناو ئەو چەند دەستنووس و تێکستانەی هەر لای مامۆستایان (مەلا عبدولکەریمی مودەریس و کورەکانی)دا هەن؛ لە پاکترین دەستنووسیاندا؛ کەهی مامۆستا (مەلا محەمەدی عبدولکەریمی چرۆستانی)یە، (٧) حەوت بەیتی ئەم شیعرە، بە شیعری (نالی) دانراوە..لە کاتێکدا لە هەردوو شیعرەکەدا، بەیتی یەکەم، بێجگە لە واژەی (عەزیزان)و (رەفیقان)، وەك یەکەو بەیتی دواییش لەهەردوو جێگاکەدا وەك یەکە.. ئەو تێهەڵکێش و خواستنەی کە ئەم مامۆستایانە دەڵێن گوایە ( مستەفا بەگی کوردی)، بۆ شیعرێکی خۆی، ئەو چەند بەیتەی (نالی) خواستبێت؛ من وەك سەرنجم لە دیوانی هەرسێ شاعیرەکەی میرنشینی بابان: (نالی، سالم، کوردی)داوە؛ بەشێکی لەم خواستنەم بەرچاو نەکەوتووە..ئەمجۆرە خواستنە لەنێوان شیعرەکانی (بێسارانیو مەولەویو ئەحمەبەگی کۆماسی)دا هەبووە. بەلاّم لای ئەمان نییە. دەڵێم لای ئەمان نییە؛ ئەگینا دوای ئەمان شتی وا هەیە..*

---

*: گۆڤاری نووسەری کوردستان - ژمارە (٤) بەهاری ١٩٨٢

سەرنج: مەبەست لە دیوانی ((نالی))؛ ئەو دیوانەیە کە مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و کورەکانی: کاك فاتیح و کاك محەمەد ئامادەو چاپیان کردووە. چاپخانەی کۆری زانیاری کورد - بەغدا - ساڵی ١٩٧٦.

# رەخنەی ئێمەو خۆزگەی من

بەو هۆیەوە کە رەخنە، لەچاو بەشەکانی تری ئەدەبداو بە بەراورد لەگەڵ گەلانی دوورو دراوسێماندا، تەمەنی زۆر درێژ نییە، بۆیە هێشتا بە تەواوی شوێن پێی خۆی لە ئەدەبەکەماندا نەکردۆتەوەو کاتێکیش کە رەخنە لای ئێمە لە چرۆکردندا بوو، شەپۆل و تەوژمی ئایدیۆلۆژیا، دەسڵاتی بەسەر ئەدەبدا پەیداکردو رەخنەش وەك دەستە خوشکەکانی تری بەشەکانی ئەدەب، سێبەری بڕیاری ئایدیۆلۆژیای کەوتە سەر. کە هەر ئەم سێبەرە قورسە، خۆی لە خۆیدا، لای ئەدیب و هونەرمەندی رەسەن و داهێنەر، سێبەرێکی قورسو تاریکی هەبوو. چونکە لەم تەمەنە ئێجگار کورتەی رەخنەدا لای ئێمە، ئەگەر سەرنجێکی ورد لەو چەند لاپەڕەیە بدەین، کە لەم چل پەنجا ساڵەی دواییدا، بەناوی رەخنەوە نووسراوە؛ جگە لە چەند لاپەڕەیەکی گەش و ئابڕوومەند، ئیتر هەمووی بریتییە لە نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ساردوسڕی ئایدیۆلۆژیا ئامێزی بەرهەمەکە، وەك: کۆنەپەرست، پێشکەوتنخواز، شۆڤینیست، ناسیۆنالیست، ریالیزمی سۆسیالیست، ریالیزمی و..ناوو ناتۆرەو تانەو تەشەر لە بەرهەمەکەو لە نووسەرەکەش. کە ئاکامیش، ئەوەندە باس و خواسی لاوەکی ئاخنراوەتە رەخنەکەوەو ئەوەندە شتی سەیرو سەمەرەو دوور لە خودی دەقەکەوە باسکراوە، خوێندەواری بەسزمان، سەرەداوی نیازو مەبەستەکەی لا گوم بووەو نازانێ باس لە چ ئەکرێ!. لە کاتێکا پەیامی رەخنە، شتێکی ترەو لەمانە پیرۆزترەو رەخنەگر لەناو ئەدەبی گەلانی پێشکەوتوودا پێی ئەوترێ: داهێنەرێکی ترو لەسەری پێویستە لایەنە شاراوەو نەدیوەکانی بەرهەمەکە ببینێو شوێن سنعەتسازیو وشەئاراییو داڕشتنی پەخشانی دەقەکەو ناسینەوەی بۆن و بەرامەی دەقەکەو لێکدانەوەی رەمزەکان و مەودا دیتنەوە، بۆ مانای چەندین لایەنەی وشەکان و لەسەروو ئەمانیشەوە شوێن پێهەڵگرتنی پەروەردەی فەرهەنگییو فیکرییو هونەریی هەمەلایەنەی نووسەرەکەو دیدو فەلسەفەی بۆ ژیان و مردن و رووداوەکانی دەوروپشتیو؛ دیتنی تێکڕای ئەمانەش، بە پێوانەی کات و شوێنی دەقەکە، سەیر بکات. کە ئەگەر پێشەکیش رەخنەگر خاوەنی زانیارییەکی دەوڵەمەند نەبێ لە مەیدانە جۆربەجۆرەکانی فەرهەنگدا، ئەوە هەر لە بنچینەوە لە تێگەیشتنی زاراوەی رەخنە

نەگەیشتووە. چونکە هەموو دەقێکی ئەدەبی، بریتی‌یە لە سەرتاپای زانینە جیاجیاکانی ئەو نووسەرە، کە لە دەقەکەدا رەنگ ئەداتەوە؛ نەك تەنیا یەکێك لە بوارەکانی فەرهەنگ و زانیاری.

بۆیە لەم تێگەیشتنە ئاوەژووەی رەخنەدا، ئەوەندەی پێناسەی ئایدیۆلۆژیانەمان لەسەر پێوانەی ئەدیبان و شاعیرانی گەورەی وەك: توفیق وەهبی‌و پیرەمێرد و گۆران بیستووە، ئەوەندە پێناسەی راستەقینەی ئەدەبی تەواومان لەسەریان نەبیستووە.!

لەبەرئەوە بۆ راستکردنەوەی ئەو تێگەیشتنە چەواشەیە، لەمانای زاراوەی رەخنە، پێویستمان بەو رەخنەیە هەیە، کە شوێن پێی بەرهەمە ئەدەبیەکە بکەوێو لەناوجەرگەی دیێن و گەڕان و پشکنینی بەرهەمەکەوە، قسە لەسەر دەقەکە بکات نەك لەدیوی دەرەوەی دەقەکە. کە ئەمە تا ئێستا وای کردووە، ئەو نووسینانەی بەناوی رەخنەوە لەسەر بەرهەمێك بنووسرێ، پێشەکی ئەوەی خۆی بە رەخنەگر زانیوە، بریاری ئامادەکراوی لەسەر دەقەکەو لەسەر نووسەرکەش گەڵاڵە کردووە، بەمەش هەرچی دەرگاکانی تێگەیشتنی ئەدەبیی هەیە، لەسەر خۆی‌و لەسەر خوێندەواران پێوەداوە. بە بێ‌ئەوەی لەوە بگات کە لە سەرێکەوە: خۆڵی کردۆتە چاوی خوێنەران و، لەسەرێکی تریشەوە لەوە ناگات، کە تەمەنی بەرهەمی ئەدەبی‌و هونەری رەسەن، لە تەمەنی ئەو نووسینە کاڵ وکرچانە درێژترەو ژیان و نەمریی لەگەڵ خۆیدا هەڵئەگرێو رۆژێك ئەبێ رەخنەگری بە تواناو بە سەلیقەو بێ‌لایەن، لە دیدی ئەدەبیەوە بینرخێنێ. هەروەك چۆن تا ئێستا نالی و مەولەوی و مەحوی و چەندانی تریشمان، چاوەڕێی رەخنەگری لێهاتوو ئەکەن؛ کە ئەگەر هێشتا پەیدا نەبووبن، مانای وانیە ئەو شاعیرە نەمرانە شایانی ئەوە نین، دەیان و دەیان کتێبی رەخنەیی بە پێزیان لەسەر بنووسرێ، بەڵکو ئەمە باشترین بەڵگەیە، بۆ ئەوەی بڵێین: ئەو رەخنانەش کە تا ئێستا لەسەر هەندێ بەرهەم و شاعیری گەورەمان نووراون جگە لە هەندێکیان، کەشایانی رێزن، زۆربەیان سادەو ساکارو راگوزاریانەن و پڕن لە گیانی نووسینی رۆژنامەئامێزو نائاگایی ئەو رەخنانە، لە سنعەتسازیی بەلاغەت و کلاسیزم و گیانی قوول و رۆچووی ئەو بەرهەمە رەسەنانە.

ئەم دیاردییە ئاوەژووی رەخنە، لای ئێمە کە رەخنەگر پێش بەرهەمی ئەدەبیی

کەوتوە؛ واتە لە پێش ئەوەوە بەرهەمەکە بەچاوی گەشتوەرو پشکنەری سەوداو عەڤدال و عاشقانە ببینێ، بڕیاری گەلاڵەکراوی ئامادە کردووە؛ ئەو هاوکێشەیەمان لادروست ئەکات کە بڵێین لەم بارەدا رەخنەگر پێ بزانێ یان نەزانێ، لەباری ئایدیۆلۆژیاوە کەسێکی تەرەفدارە! کە مەسەلەی تەرەفداریش لە رەخنەدا، لە بەرامبەر هەڵسەنگاندن و نرخاندندا لە بناغەوە رەت ئەکرێتەوە. چونکە کە رەخنەگر تەرەفدار بوو، ئەو کاتە نرخاندنە ئامادەکراوەکەیشی، لەوەبەدەر نابێ کە دەقەکە، بە چاك باس بکا، یان بە خراپ. واتە هەڵسەنگاندنەکەیشی وەك قسەی ئەو شاهیدە وایە کە لەبەردەم دادگادا، لە چاکە، یان لە زیانی یەکێك لە بەشدارانی رووداوێك بدوێ. کە پوختەی ئەم تەرەفدارییە، مانای پێشەکی هەڵوێست وەرگتنە لە دەقەکە. ئەم هەڵوێست وەرگرتنەش، رەخنەگرو دەقەکەش، لەبەردەم چەند خاڵێکی نالەباردا دائەنێ.

١- ئەگەر رەخنەگرەکە بزانێ هەڵوێستی نووسەرەکە، لەباری ئایدیۆلۆژیاوە هاوهەڵوێستی خۆیەتی، ئەوا دەقەکە لاوازبێ، یان بەهێز؛ بێ‌سێ‌ودوو، بەچاوی ستایش و پیاهەڵدان لێی ئەدوێو شاخ و باڵی لێ پەیدا ئەکاو لە هیچی نەبوو، تێکڕای رەمزو هیماو ناوەڕۆك و پاڵەوانەکانی دەقەکە، واباس ئەکا کە هەموویان پەیامی ئەدەبیی‌و هونرییان بەسەرکەوتوویی ئەنجامداوە. کە رەنگە زۆربەی ئەو شتانەی رەخنەگرەکەش بیروبۆچوون و لێکدانەوەیان لەسەر ئەنووسێ، خودی نووسەرەکە؛ ئەوانەی هەر مەبەست نەبووبێ!. نموونەی زەقی ئەم کارە دکتۆرا نامەکەی حسێن علی شانۆف و چەندانی تریش لە هاوبیران و هاوهەڵوێستانی گۆران-ی شاعیر، کە شاعیرێتی گۆران بەوە گەورە ئەکەن، لێکدانەوەی هەڵە، لەسەر شیعرەکانی ئەکەن و شیعرە سیاسیە لاوازەکانی، بە خوێنەران و شیعردۆستان ئەناسێنن!! لە کاتێکا گۆران، پێش چوونە ناو قوناغی شیعرە سیاسیەکانیەوە، شاعیرترو هونەرمەندتر بووە. بەواتە: گۆران لە شیعرە سیاسیەکانیا تێکۆشەرترو شۆڕشگێرترە، نەك شاعیرتر! یان نموونەی تری ئەمجۆرە رەخنانە: ئەو هەڵوێستە بوو، کە دکتۆر کامیل بەسیر، لە کۆتایی ساڵانی پینجاو سەرەتای شەستەکانەوە لەسەر هاوهەڵوێستی خۆیو کامەران موکری شاعیر، گرتبوویە بەرو کامەران موکری لەبەردەم دەستپێشکەریو داهێنانە گەورەکەی گۆراندا قوت ئەکردەوەو بە هەموو توانایەوە ئەیویست ئەوە بسەلمێنێ کە کامەران،

لە گۆران گەورەترە!. لەکاتێکا ئەگەر شیلەی شیعری کامەران بگوشرێ، تێکرا تام و بۆن و رەنگی قۆناغی رۆمانسیانەی گۆران -ی لێ دێت!.

ئەمجۆرە رەخنانەش، وەك نووسەری گەورەی عەرەب عیسی الناعوری ئەڵێ: ئەمانە، رەخنەگری تەورزین بە دەستن و بەزۆری زۆرداریو تۆپزی، ئەوەی ئەوان لە بەرهەمەکەیان ئەوێ، وای لەسەر ئەنووسن، نەك دەقەکە خۆی.

٢ـ ئەگەر رەخنەگرەکە چەند هێمایەکی لە دەقەکە بینی، کە لەگەڵ خۆیدا هاوپێچاڵی یەکترن، ئەوا دیسان دەقەکە بەختەوەر ئەبێو هەرچی شتی چاك بێ، ئەیخاتە پاڵی.

٣ـ لەو روانگەیەوە کە وەك لە سەرەوە وتمان، مادام رەخنەگر لەژێر سێبەری ئایدیۆلۆژیادا بیر ئەکاتەوەو بڕیار ئەدا؛ ئەوا هەموو بۆچوونەکانیشی لەسەر دەقەکە، یەك لایەنەو تەنگ و تەسك ئەبن و مەودای لێکدانەوەی بە بەریەوە نییە، فراوانتر بکرێ، لە کاتێکا چ ئەدەبی کلاسیزم و چ ئەدەبی سەر بە رێبازگە جیاوازەکانی تریش هەریەکەیان هەڵئەگرن، چەندان جۆر لێکدانەوەیان لەسەر بکرێ؛ واتە وەك نمونە: لە ئەدەبی کلاسیزمدا، بەلاغەت، مەجازی وێنەی شیعرییو لە ئەدەبی ئێستاشدا مەودای هەمە لایەنەی وشەو واتاو ..هتد. رازی نابن بە یەك چاو، بەیەك مەبەست، بەیەك مەودا، سەیر بکرێن. بۆیە ئەمجۆرە رەخنانە، خۆیان لە خۆیاندا کۆت و پێوەندی ئەدەبیین و بەناوی رەخنەوە ئەبنە مۆتەکەو درنج و دێو، باڵی تیژی بیرکردنەوەو ئاسۆی بەرینی خەیاڵ، ئەخەنە تەلبەندی درکاویو داهێنانی تازەو تازەگەریی، بە دنیای باوو سەپاوی سەردەم، بەلایانەوە نامۆو سەیرو سەمەرە ئەبێو لەمجۆرە بوارانەداو لەژێر سێبەری ئەم شێوە رەخنانەدا، داهێنانی گەورەی ئەدەبیی، تووشی دەردەسەرییو تەنگو چەڵەمەو داو بۆنانەوەی زۆر ئەبێو زۆریش بە درەنگ و بەماندوبوونی زۆری داهێنەرەکە، جێی لەناو جەماوەرو ئەدەبدۆستاندا بۆ ئەکرێتەوە. چونکە ئەم رەخنانە بە تۆپزی ئەیانەوێ دەقەکە بخەنە ناو بازنەیەکی دیاریکراوەوە، کە لە مێشك و بۆچوونی خۆیاندا رەنگیان بۆ رشتووە. بەبێ ئەوەی لەوە بگەن کە ئەدەبی سڵ و چاوقایم و رەسەن، دوژمنی سنوورو نەخشە بۆ دانانەو بە پێچەوانەی هەموو شتەکانی ژیانەوە، ئەگەر زەریابێ، رقی لە رۆخەو ئەگەر تابلۆ بێ، رقی لە چوارچێوەکەی خۆیەتیو ئەگەر باڵندە بێ، حەز ئەکا ئاسمانی فڕینی لێتەنگ نەکەنەوەو ئەگەریش مرۆڤ بێ، حەز

ئەكا بە هەموو مانا ئازادی، ئازاد بژی.. کەلەراستیدا بەلای منەوە، بەرهەمی ئەدەبی رەسەن و نەمر، وەك مرۆڤی زیندوو، یان وەك گیان لەبەری زیندوو وایە، کە ئەگەرچیش لەسەردەمێکی مێژوییو جێگەیەکی دیاریکراوی جوگرافیاییدا لە دایك بووبێ، بەلاّم ئەبێ بەو چاوە سەیر بکرێ کە ئەم زیندەوەرە، لەکاتی لەدایك بوونیەوە، تا ئەوکاتەی ئەو رەخنەگرە، قسەی لەسەر ئەکا، هەر لە ژیاندایەو ماکی ژیان و نەمریی، لە دووتوێی هونەرەکەیدا هەلّگرتووە. ئەگەریش ئەم گیانە زیندووەی تیا نەبووایە، ئەوەی هەلّنەئەگرت قسەی تازەی لەسەر بکرێ. بۆیە هەر بەم پێودانە، ئەبوایە لەم چەند سالّەی دوای ژیانی **حافظ** دا، ئیتر شتی تازەی لەسەر نەنووسرێو بە دیدی تازەتریش نەخوێندرێتەوە.

لەبەر ئەوە قسەکردن لەسەر بەرهەمی ئەدەبیو هونەریی، وەك قسەکردن نیە لەسەر دیاردەیو رووداوە سروشتیەکان؛ چونکە وەك وتمان بەرهەمی ئەدەبی نەمر، هێشتا هەر لە ژیاندایە، بەلاّم رووداوی سروشتیی، لەدوای روودانیان، ئیتر کۆتاییان هاتووە. بۆ وێنە کە ئەلّێن بومەلەرزە، یان لافاوە گەورەکەی فلاّنە سالّ و فلاّنە جێگە، هەمیشە قسەکەمان لەوێدا کۆتایی دێت، کە ئەلّێن ئاماری زیان و کوژراوی ئەم رووداوە، هەر ئەوەندەیە کەلەوە رۆژگارەدا سەرژمێرکراوە. واتە ئیتر تەمەنی بوومەلەرزەکە کۆتایی هاتووەو ئەو زیان و زەبرەی کە لە کاتی روودانیدا، بەدەوروبەرو هەستی خەلّکی ئەو رۆژگارەی گەیاندووە، هەر ئەوەندە ئەبێو ئیتر لەمەودواتر زەبرو زیانی بۆ مرۆڤ و رۆژگاری دوای خۆی نابێ؛ بەلاّم فرمێسکە شیعرییەکانی نالی و سالم، کەبۆ روخانی میرنشینی بابان -یان رشتووە؛ بەلاّم فرمێسکە شیعرییەکانی مەولەوی و گۆران، کە بۆ (عەنبەرخاتوون و ئەورەحمانی کوری مەحمودی یارەیس و هیواو گولاّلّە)و..هتد رێژراون، هەتا ئێستاش هەر ئەرژێن و لەگەلّ هەموو خوێندنەوەیەکی تازەتری ئەو فرمێسکە شیعرییانەیاندا، سەرلەنوێ کسپەو سۆزی تازە ئەخەنەوە هەست و هۆشی خوێنەری هەموو رۆژگارێکەوە. بۆیە کە رەخنەگر باس لەمجۆرە فرمێسکە شیعرییانە ئەکا، ئەبێ ئەوەی لەیاد بێ، کەهەر ئەو رۆژو ساتانەی ئەو فرمێسکە شیعرییانە رژاون، کەس و کارو دۆست و یارانی تریش، فرمێسکیان بۆ ئەو کۆستانە رشتووە، کە ئەم شاعیرانە، کۆستەکانیان کردووە بە شیعر؛ بەلاّم فرمێسکی ئەو کەس و کارو دۆست ویارانە، هەر دوای چەند سات و رۆژێکی دوای روودانی کارەساتەکە، وشك

بونەتەوەو ئەوەی نەمریی‌و لەبیرنەچوونەوەی بەو کۆست و ڕووداوانە بەخشیوە، بەتەنیا هونەری بەرزی شیعرە، کە بۆتە گیانێکی نەمرو چۆتە جەستەی ئەو یادانەوە.

کەواتە کە ڕەخنەگر، لە بەرهەمێکی ئەدەبیی ئەدوێ، ئەبێ ئاگای لەوەبێ کە لەگەڵ گیانی زیندووی بەرهەمێك ئەدوێ، نەك بۆنەو وردەکارییەکانی مێژووی بەرهەمەکە. چونکە ئەگەر ڕۆژی سەدان و هەزاران عەنبەرخاتون و هیوا و گوڵاڵە بمرن، بیر ئەچنەوەو ناچنە مێژووی هونەرەوە. بەڵام ئەگەر عەنبەرخاتوون-ێك ببێتە ڕەمزێکی زیندووی شیعری فرمێسکاوی، ئەوە دەسەڵاتی ئەفسوناوی شیعرە، کە دەستاودەست و سنگاوسنگ، لەگەڵ مێژووی ئەدەبدا ئەیگێڕێ‌و هەمیشەو هەمیشە، دلۆپ دلۆپ، فرمێسکە درشتەکانی ئەو قوڵپی گریانانەمان دێنێتەوە پێش چاو، کەنەك لە چاوی شاعیرەکەوە، بەڵکو لەهەستی شاعیرەکەوە تکاون. لەبەر ئەوە دواندنی بەرهەمێك لای ڕەخنەگرێکەوە، ئەبێ دواندنی هاوهەستیی بێ، لەگەڵ هەستی هەمیشە لەکوڵ و ژانگرتووی خاوەن بەرهەمەکەدا. یان هەر هیچ نەبێ، ئەبێ نزیکبوونەوەبێ لە پەنجەرەو دەلاقەی گنگڵ و ڕەنج و شەونخوونی‌و هەست و نەستی نووسەرەکە.

ڕوونتر بڵێم: ڕەخنە بەهەموو مانای وشەی ئەوینداریەوە، ئەوینداریی کردنە لەگەڵ دەقە ئەدەبییەکەدا. چونکە دوای خوێندنەوەی دەقێکی ئەدەبی، دوای چێژوەرگرتن لەسەرومڕی دەقەکە، دوای ئەوەی دەقەکە، ئاسۆی بەرینتر لە خەیاڵ و بیرۆبۆچوونی ڕەخنەگرەکەدا دروست ئەکاو وا لە ڕەخنەگر ئەکا، کە بەڕامان و سەرسوڕمان و خورپەو خرۆشەوە، بڕوانێتە دەقەکەو دوای ئەوەی لەهەموو هەست و هۆش و گۆشیەوە، دەقەکەی لا شیرین و خۆشەویست ئەبێ، ئەوسا حەز ئەکا زیاتر لەگەڵ دەقەکەدا بژی، زیاتر بدوێ، زیاتر لە نهێنی‌و جوانییە شاراوەکانی تێبگات؛ ئەوسا گیانی پڕ ئەبێ لە خۆشەویستی ئەو تێگەیشتنە، ئەوسا هەست ئەکاو حەز ئەکا ئەو خۆشەویستیەی بۆ خەڵکی دەوروپشتی بگێڕێتەوە: کە لێرەدا ئەم گێڕانەوەیە، بەمانای ئەدەبیی، ئەبێتە: ڕەخنەی ڕاستەقینەی ئەدەبیی.

خۆ ئەگەر ئەم ڕامان و سەرسوڕمان و خۆشەویستیە هاوکێشەو تاوتەریبە، لەنێوان ڕەخنەگرو دەقە ئەدەبییەکەدا نەبوو، ئەوا هەرچی لەسەر دەقەکە بنووسرێ، هەڵبەستراو ئەبێ. وەك ئەوە وا ئەبێ کورێك، لە نەدیو نەناس، شیعر بۆ کچێك

بڵێ، کە هیچ بیرەوەریو یادگارو شێوەیەکی لە ناخیا جێ نەهێشتبێ.

بەڵام ئەم خۆشەویستیەی نێوان رەخنەگرو دەقەکەش، نەبێتە خۆشەویستیەکی کوێرانەی سۆزئامێز، کەهەر بە تەنیا لایەنی جوانیی لە دەقەکەدا ببینیو خۆی بدا بەدەم تاڤگەی خوری دەقەکەوە. بەڵکو ئەبێ لەم خۆشەویستیەدا، لەگەڵ دڵ و هەستیا، مێشکیشی بخرێتە کارو بەچاوی هەست و بیری زانستیانەوە، لەهەموو لایەنەکانی دەقەکە بڕوانێ؛ وەك ئەو زانای ئاسەوارناسانەی بە عەزرەت و تاسەو پەرۆشەوە بە شوێن پاشماوەی کۆنینەدا عەڤداڵن و کە پێیان ئەوترێ فیسارە جێگە، پاشماوەی دێرینەی تیایە؛ یەکسەر ناچن بە پاچ و بێڵ بەر ببنە جێگەکە، بەڵکو بە کەرەسەو ئامێری وا لەگەڵ جێگەکە ئەکەونە کار، کە ئاسەوارەکە زیانی پێ‌نەگات؛ زیاتریش لەخودی ئاسەوارەکە نزیکتر ئەبنەوە، کەرەسەو ئامێری نەرمترو نیانتر بەکار دێنن، نەك ئاسەوارەکە بڕوشێ، یان شوێنێکی زیانی پێ‌بگا. ئیتر کە ئەگەنە ئاسەوارەکە دەستیان لێی گیر ئەبێ، ئەوسا ئەو لێکۆڵینەوانەش کەدواتر لەسەری ئەنووسن، بریتی ئەبێ لەباسی سەرتاپای چونێتی ئاسەوارەکە. واتە سەرەرای عەزرەت و تاسەشیان بۆ گەیشتن بەو ئاسەوارە، بەڵام لیکۆڵینەوەی زانستیانەیان، لەسەریان پێویست ئەکا هەرچی شکاوییو زیان و کەم و کووریش لە ئاسەوارەکەدایە، بەوردی باسی بکەن. کە ئەم باسکردنەشیان لەشکۆو پیرۆزی ئەو بە یەکتر گەیشتنەی ئاسەوارناسەکەو ئاسەوارە بەرجەستەکەش کەم ناکاتەوە؛ ئەگەر ئەوەندەی ترشیرینتر و گەورەتری نەکا. کە رەنگە گیانی نووسین و ووردبوونەوەی جار لە دوای جار، نهێنی تری لا ئاشکرا بکا. وەك ئەو دوو دڵدارەی بۆ یەکەمین جار، کە ئەچنە ژووان؛ ئەوەندە بە تاسەو ترس و سام و بیمی ئەو دیدارەوە، لە یەکتر نزیك ئەبنەوە، رەنگە نەتوانن تێر سەیری یەکتریش بکەن و ئەوەی لە دڵیاندایە، بۆ یەکتری هەڵڕێژن؛ بەڵام کە ئەم ژووانە، چەندان جاریتر، دووبارە ئەبێتەوە، نهێنیە شاراوەکانی یەکتیریان زیاتر بۆ دەرئەکەویو هیچیش لەشکۆی ئەوینەکەیان کەم ناکاتەوە. بە تایبەتیش ئەگەر ئەوینەکەیان مەزن و قووڵ بێ، ئەوا ئەوەندەی تر پڕ ئەندێشەترو سیحراویتر ئەبێ.

رەخنەگریی عەزرەتیو عەڤدالیش، بەوێنەی ئەو ئاسەوارناس و جووتە دڵدارەیە، کە بەو تاسەیەوە، وەك ژووانی دڵداری، بە دنیای دەقەکەدا رۆبچێ، لەهەر رۆچوونێکیشدا نهێنییەکی لا ئاشکرا بێت و هەر جارێکیش لەو

ڕۆچوونانەدا، ماناو تام و چێژی تایبەتی تری هەبێو بەیەك چاویش، بۆ شیعرو چیرۆك و ڕۆمان و شانۆنامەو تابلۆیەکی هونەریی، وەك یەك نەڕوانی؛ چونکە هەریەکە لەمانە، تێگەیشتێکی تایبەتی پێویستە، بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنیان و هەریەکەشیان ئاستێکی جیاوازی لە بڕیارو نرخاندن پێویستە. بەواتا: ئەو ڕەخنەیەی کە شیعری پێ ئەنرخێنرێ، ئەبێ بزانرێ لە شیعردا گیانی لۆژیك (منطق)، کەمتر بایەخی پێئەدرێ، وەك لە چیرۆکدا پێی ئەدرێ. یان ئەم گیانە، تادێت بۆ شانۆنامە، زیاتر پێویست ئەکا لە لۆژیك نزیکتر بینەوە.

ئەمانە لە لایەك، لەلایەکی تریشەوە، ئەبێ ڕەخنەگر هەمیشە ئەوەی لەیاد بێ کە قسەکانی ئەو، واتە: نرخاندن و هەڵسەنگاندنەکەی، ئەکەوێتە مێژووی دوای هاتنە دنیای بەرهەمێکی هونەریی و ئەدەبییەوە. واتە لەدوای ئەوەوەیە، کە ژیان و نەمریی، کراوە بە بەر دەقێکی ئەدەبیی و هونەریداو ئەو بەرهەمەش بە گوێرەی خواست و ئارەزووی ئەو، دروست نەبوون. بۆیە کەلەگەڵ دەقەکە ئەدوێ، ئەوە لەیاد نەکا کە چۆنێتی هاتنە دنیاو ژیانی تایبەتی ئەو دەقە، پەیوەندی بە زەوق و حەزو هەست و هۆشی ئەوەوە نیەو کەم و زۆر نابێ بەدیدو ڕوانگەی خۆی، مەرج و خۆزگەو سنوور، بۆ دەقەکە دابنێ و بڵێ نەئەبوو نووسەر وابیر بکاتەوە، یان خۆزگە داڕشتن و کێش و مۆسیقای ئەم بەرهەمە، بەمجۆرە بوایە. چونکە وەك وتمان ڕەخنەگر لەم کاتەدا قسە لەسەر زیندەوەرێك ئەکا، کە خۆزگەکانی ڕەخنەگر، وەك ئەوە وائەبێ بە کچێك بڵێی خۆزگە ڕەنگی چاوت هەنگوینی، یان سەوز بوایەو باڵاشت ئەوەندە سانتیمەتر بەرز بوایە. هەروەك چۆن نابێ ئاسەوارناسەکە بڵێ: نەئەبوو هەرەمەکانی میسر، لە جێگەیەکی وەك سەرووی ئەفریقیا بوونایە، چونکە ناوچەیەکی دواکەوتووە!.

خۆ ئەگەر بە گوێرەی دیدو هەڵوێست و حەزی ڕەخنەگر، ئەیەوێ لە بەرهەمێك بدوێ، باهەر ئەو ڕەخنەگرە خۆی، بەرهەمێکی ئەدەبیی، یان هونەریی، بە زەوقی خۆی بخولقێنێ و هەر خۆیشی قسەی لەسەر بکاو ڕەخنەی لێ بگرێ!. چونکە کە وترا: ڕەخنەگر، ئیتر ڕادەی هۆشیاریی و تێگەیشتنی لەو ئاستەدایە کە لەباری ڕەوانناسییەوە، ئەوە بزانێ هیچ تابلۆیەکی هونەریی، هیچ شیعرێك، هیچ چیرۆکێك، هیچ دەنگێك، بەکورتی هیچ بەرهەمێکی هونەری و ئەدەبی، کوت ومت وەك یەك نین و کە وەکو یەکیش نەبوون، لێیان ناخوازرێ ئەبێ وەك یەك بن!. یان

رونتر بڵێم: ئەبێ وەك خواستی رەخنەگرەکە بن، تا لەگەڵ ئارەزووەکانیا بگونجێ!.

لەمەش گرنگتر ئەوەیە ئەگەر رەخنەگر، بەدوای ئەو بەرهەمەدا بگەرێ، کە هاوهەستی ئەون، ئەوا لەم بارەدا وەك لە سەرەتاشەوە وتمان، ئەم دیدو هەستە تایبەتییەی، ئەیخاتە مەیدانی تەرەفداریەوە، کە ئەمەش جگە لەوەی هەر لە بنەڕەتەوە لەگیانی راستەقینەی رەخنەی دوور ئەخاتەوە؛ لەهەمان کاتیشدا ئاسۆی حەزو هەنگاو هەڵهێنانی زیاتری لەیەك رێبازگەدا قەتیس ئەکا، کە ئیتر رێبازگەکانی تری ئەدەبیو هونەریی بەلاوە بێبایەخ بن. بەمەش وەك ئەو ئاسەوارناس و مێژووزانەی لێ دێت کە ئاگاداریو شارەزایی تەنیا لەسەر یەك رووداوی مێژووییەو هەر ئەوەیشی پێ گرنگە.

لەمەشدا مەبەست رەتکردنەوەی هیچ رێبازگەیەکی ئەدەبی نییە، بەڵکو مەبەست رەتکردنەوەی ئەو بیروبۆچوونە رەخنەییانەیە، کەلەیەك دیدەوە، لەیەك کلاورۆژنەوە سەیری هەموو داهێنانە جوانە مرۆڤایەتیەکان بکرێ؛ بەبێ ئەوەی لەوە بگەن کە خەونە رەنگاورەنگەکانی مرۆڤایەتی لەوە بالاترن، مەرج و خواست، بۆ ئەوە دابنرێ مرۆڤ چۆن خەون ببینێ، باڵندە چۆن بفڕێو بخوێنێ، گوڵ چۆن بگەشێتەوە، گەردەلوول، چۆن هەڵبکا، بەختەوەر، چۆن پێبکەنێ، خەمگین چۆن بگری،دڵدار چۆن چۆنی بیر لە دلدارەکەی بکاتەوە.. بەڵکو ئەیانەوێ مەودای فڕین بۆ باڵندە دیاری بکەن!!.

بە پێچەوانەی ئەمەوە، هەندێ رەخنەگر بۆ ئەوەی خۆیان لەم رێبازگە تەنگبینە رزگار بکەن و گوێ لەحەزو خواستی خەڵکیتریش بگرن، ئەچن بە پیر قۆستنەوەی زەوق و حەزی جەماوەرەوە! گوایە جەماوەر دەسەلاتی سەر پشککردن و هەڵبژاردنی راستەقینەی هەموو شتەکانە! کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بریارێکی کوشندەیە بۆ رەخنەگر. چونکە زۆرجار هەستی جەماوەر، هەستێکی کاتییە، یان هەستێکی ساکارە، پاکە؛ وەك ئەو پەپوولەیە وایە، کە گوڵی نایلۆنیشی وەك گوڵی سروشتیی دێتە بەرچاوو بەسەریەوە ئەنیشێتەوە؛ یان رەنگە هەر ئەم هەستە پاکەی جەماوەر، تەوژمێکی ئایدیۆلۆژیا، لەپشت پەردەوە، بە مەبەستی ناوبانگ پەیداکردنی ئەدیب، یان هونەرمەندێ، بیخرۆشێنێ. وەك چۆن سیی، چل ساڵ لەمەوبەر، لە شوورەوەی، بۆ یەفتەشینکۆ کرا، کە بەزۆر ئەیانوویست لای جەماوەر بیکەنە لووتکەیەکی شیعریی؛ هەر وەك لە فەلەستین-یش ئەم کارە بۆ تۆفیق زیاد

و فدوی طوفانکرا. ئێستاش لای خۆمان، ئەگەر لەنێوان نالی و مەولەوی و قانع و حاجی قادردا، جەماوەر بکەین بە سەرپشك، بێ سێودوو، قانع و حاجی قادر-یان لەنالی و مەولەوی پێ پەسندترە!.

لەبەرئەوە ئەمجۆرە رەخنەگرانە، کە ئەبینن هەندێ جار جەماوەر چەپڵەی زۆر گەرم و پەسندیی‌و ئافەرین بۆ ئەدیبێك،یان هونەرمەندێك ئەسەلمێنن، ئیتر ئەمیش شوێن شەپۆلی هەستی خرۆشاوی جەماوەر ئەکەوێو بەهەمان خرۆشاویی جەماوەرەوە، بەتاسەوە بەرهەمی ئەو ئەدیب و هونەرمەندە، پەسەند ئەکاو بە پەلە ئەکەوێتە پیاهەڵدانی بەرهەمەکەیان و ئەفسانە دروستکردن لە ستایشیانا!. لەکاتێکا ئەو بارەیە کە وەك لە سەرەوە وتمان: خۆڵ کردنە چاوی خۆی‌و جەماوەرەوەیە. چونکە هەر پاش ماوەیەکی کەم، کە شەپۆلی خرۆشاوی جەماوەر، لە دەوری ئەو ئەدیب و هونەرمەندە (لەبەر هەر هۆیەك بێت) ئارام ئەبێتەوە، ئەمیش ئەگاتە ئەو ئەنجامەی کە شوێن تراویلکە کەوتووە. بە تایبەتیش کە لەوە گەیشت ئەو ئەدیب و هونەرمەندە، سەر بە ئایدیۆلۆژیایەك بوون؛ ئەوسا ئەزانێ زۆربەی ئەو نووسەرانەی پشت بە رۆژنامەو گۆڤارو بڵندگۆی ئەم و ئەوو چەپڵەی سۆزئامێزی جەماوەر ئەبەستن، ئەوانەن کە بەلای زۆرەوە متمانەیان بە خۆیان نییە. یان بێبەهرەن و رەگ و ریشەیان نییە، تا بەخاك و مێژووی ئەدەبی گەلەکەیاندا رۆبچن. لەم بارەدا، نەك هەر رەخنەگرەکە، بەڵکو ئەدیب و هونەرمەندەکەش، بۆیان دەرئەکەوێ کە هەندێ لەو بەرهەمانەی بە گوێرەی دڵی ئەم و ئەو نووسیویانە، رووی مەجلیس و کۆری ئایندەی ئەدەب و هونەری نییە. ئەوسا رەخنەگرەش لەگەڵیاندا بۆی دەرئەکەوێ کە بەتەنیا دەسەڵاتی داهێنەرانەی خودی هونەرمەندەکە، ژیان و نەمریی، بە هونەرمەندەکە ئەبەخشێ؛ نەك دەسەڵاتێکی دەرەوەی هەست و نەستی خودی نووسەرەکە، یان پیاهەڵدان و پفکردنی دەستەو لایەنێکیتر؛ چونکە گۆران ئەگەر خۆی تواناو بەهرەی شاعیرێتی نەبوایە، هەرگیز هیچ لایەنێك نەیئەکرد بەو شاعیرەی کە ئێستا ئێمە ئەیناسین.

لەم بوارەدا رەخنەگری هۆشیار، پەلەی سەلماندنی هەستی جەماوەر ناکاو بە پێچەوانەی ئەمەوە، بە شوێن ئەو داهێنەرە گەورانەدا وێڵ ئەبێ، کە بە بێدەنگیی، لەگەڵ داهێنانی گەورەدا گینگڵ ئەدەن. نمونەی بەرجەستەی ئەم دیاردەیە، نالی بوو، کەلە رۆژگاری داهێنانە مەزنەکانیدا، جەماوەری زێدەکەی خۆی، کە

شارەزوور بوو، نەیانناسی. کەچی بە پێچەوانەوە کامەران موکریی شاعیر، لەرۆژگاری خۆیدا جەماوەر نەك هەر تەنیا وەك شاعیر، بەڵکو خەونی رابەریشی تێدا ئەبینی. لەکاتێکا ئەم دوو نمونەیە لای رەخنەگری زیرەك، ئەبێ لەوبەر هەڵسەنگاندنی جەماوەرەوە بریاری خۆی لەسەر بدات، کە ئەبێ بریاری بنبڕو پێشەنگانەبێو نوقلانەو پێشبینی دۆزینەوەی بەهرەی شاراوە، بخاتە بەردەم خوێنەران و جەماوەر. هەر ئەمەشە کە ئەوترێ: ئەرکی رەخنەگر ئەوەیە، پردێکی زیرەك و روناك بێت و روناکی بێت لەنێوان خوێنەران و ئەو کیشوەرە تازەو سەوزانەدا کەچاوی وردبوونەوەو پشکنینی بەردەوامی لەبەرهەمی زیندوودا ئەیانبینێ.

بەهۆی ئەم پردەشەوە؛ واتە لە نیشاندانی ئەو بەهرانەشدا کە باس لە جوانیی بەرهەمێکی ئەدەبییو هونەریی ئەکرێ، ئەبێ شێوەی گەیاندنی بە خوێنەران، دیسان شێوەیەکی تری جیاوازتر بێو نەکەوێتە ئەوەی بەسەر ئەم پردەدا، خەریکی گوێزانەوەی ناوەرۆکی بەرهەمە رەخنەلێگیراوەکە بێ، بۆ بەردەم خوێنەران. چونکە بەلای نوسەرەوە؛ واتە رەخنەلێگیراوەکەوە، لەوە ناخۆشتر نییە کە رەخنەگران، یان کەسانیتر، بە قسە؛ یا بە چەند وشەیەکی کورت و درشت، باسی ناوەرۆك و ئەو دیمەن و پەخشانە جوانانەی بکەن؛ کە لە دەقی بەرهەمەکەیدان. لەبەرئەوەی هەموو وردەکاریو سەلیقەو دەست رەنگینی نووسەر، لەو دارشتنەدان کە رەخنەگر، یان گێڕەرەوە بە شێوەیەکی ترو بە پچڕ پچڕ، باسی لێوە ئەکەن. تەنانەت چیرۆکنووس و رۆماننووسە بەناوبانگەکانی جیهانیش، گلەیی لەوە ئەکەن، کە بەرهەمەکانیان ئەکرێ بە فیلمی سینەما. چونکە ئەگەرچی بەم کاری سینەماکردنەی بەرهەمەکانیان، ناوبانگیان بلاوتر ئەبێتەوە، بەلام لەهەمان کاتیشدا کاری سینەمایی، ئەو بەسەرهات و رووداوانە زۆرتر لەبەرچاو ئەگرێ، کەلە جموجۆڵی نێوان بەرهەمەکەدا هەن، نەك ئەو پەخشانە ئەدەبییە جوانەی، کە رۆماننووسەکەن یان چیرۆکنووسەکە، دەقەکەیان پێدارشتووە. واتە هەرچی وشەسازییو وشەئارایییو هونەری دارشتن و دەست رەنگینی نووسەر هەیە، لەو دارشتنەدا هەمووی ئەبێ بەژێرباری کاری ترەوە. یان ئەگەریش نەبێ بەژێر کاریترەوە، ئەوا هەموویان بروسکە ئاسا، باس ئەکرێنەوەو لە شوێنە سروشتیو جوانەکانی خۆیاندا، هەڵ ئەگیرێن و لە جێگەیتردا مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرێو بە واتەیەکی تر، بەرهەمە

رەخنەلێگیراوەکە (دەقەکە)، وەك ئەو مرۆڤە پڕ هەست و خوست و زیندووەی لێئەکرێ، کە ئەبرێتە ژووری عَمَلیات و لەوێ بێهۆش ئەکرێو کاری نەشتەرکارییو پزیشك کاری لەگەڵدا ئەکرێ. بەکورتی زۆرجار رەخنە ناچار ئەبێ ئەو بەردانە بجولێنێ، کە کورد ئەڵێ: هەر لە جێی خۆیاندا سەنگینن!.

سەقز

مانگی ١١/١٩٩٣

# مەولەوی!
# یان گەڕانەوە بۆ سەرچاوە؟

کامە پەریو ئەوینی نهێنیو ئەفسانەیی بوو، هەر لەسەرەتای تەمەنی مەولەوییەوە؛ دەستیان لە دڵە ئاسکەکەی وەشاندو هەموو عومری مەولەوی -یان نوقمی ئەوینێکی سەروبڕو بێبڕانەوەی سرووشت و زێدەکەی کرد، کە هەر بە گڕو کڵپەی هەمان ئەوینیشەوە، باوەش بە شیعردا بکات و خۆی بە میراتگری قەباڵەی ئەدەبێکی تەمەن درێژی دیالیکتی ی بزانیو لە ماوەیەکی کورتی تاقیکردنەوەی شیعریدا، لەیەك کاتدا: لەلایەکەوە توانی رووبەری جوگرافیای جەماوەری ئەم شێوەزمانە فراوانترو شیرینتر بکات و لە لایەکی تریشەوە لەناو ئەم جوگرافیایەدا نەخشەیەکی تایبەتمەندو جیاواز بۆ خۆی دیاری بکات؛ کە شیعری کوردی لەسەر دەستی ئەمدا، بالاتر هەڵچیو هەموو کۆڵەکەکانی ئیستاتیکای شیعر، تازەگەرییان بەسەردا بێت و جوانییو نەمریی هەتا هەتایی بدات بە شیعر!؟!؟.

ئەگەر ئەم پرسیارە چڕانە، تا ئێستا لەلایەن رەخنەگران و توێژەرەوان و شیعرناسانی کوردەوە، بە تەواوی وەلآم نەدرابێتەوەو پلەو پایەو شوێنی مەولەوی لە ئەدەبی کوردیو لەبواری نرخناسیدا دەستنشان نەکرابێ، مانای وانییە مەولەوی پەیامەکەی خۆی بە ناتەواوی داوەتە دەست نەوەی دوای خۆی، بەڵکو بە پێچەوانەوە، نەوەی دوای مەولەویو بە تایبەتیش لەم حەفتا ساڵەی دواییدا،کە کاروباری بەسەرکردنەوەی شاعیرانی کلاسیکمان و ناساندنیان کەوتوونەتە بەر رووناکییو لەهەمان کاتیشدا، کە گوڕم و هەنگاوی خێرای رەخنەی بابەتیو زانستیانەی ئەدەبیی، لای گەلانی دوورو دراوسێکانمان، لەبەرەو پێش چووندان؛ ئەوەی دەربارەی مەولەوی بۆ نەوەی نوێ ناساندرابێ، چەند تەقەللایەکی ناوبەناو بوون[1] کە لەعۆدەی ئەم کورتەنووسینەی مندا نییە، ئەو نووسینانە بەسەر بکەمەوەو هەڵیان سنگێنم. بۆیە ئەگەڕێمەوە بۆ مەیەست و ئەڵێم: قەوارەی ئەو ناساندنەی لەم حەفتا ساڵەی دواییدا بۆ مەولەوی کراوە، هێشتا بە ئەندازەو قەوارەی ئەو ناساندنە نییە، کە مەلەوی لەسەردەمی ژیانی خۆیدا، بەخۆیەوە دیوەو بۆی کراوە. چونکە مەولەوی هێشتا خۆی لە ژیاندا بووە، کە لە لایەکەوە: وەك شاعیرێکی هەرەگەورەو دیار، لەلایەن تێکرای شاعیرانی دیالیکتی **گۆران**-

ەوە، بەسەرکراوەتەوەو لێی ئالاون و وەك رابەرێکی شیعریی‌و ناوەندێکی ئـەدەبیی، خۆشیان ویستووەو نامەی شیعرییان لەگـەڵدا ئـاڵۆگۆڕکردووە؛ لەلایـەکی تریشـەوە وەك مرۆڤ لەهەموو شاعیرانمان زیـاتر پـەیوەندی کۆمەلایـەتی بـەهێزبووەو نامـە گەلێکی زۆری لیٚ جێماوە، کە بۆ دۆستگەلێکی سەربە توێـژو چینـە جیاجیاکـانی کۆمـەڵ نووسـیویێتی‌و ئەیسـەلمێنن کـە چ لای جـەماوەری هـەژاری ناوچـە دواکەوتووەکەی‌و چ لای پیرو پیرزادەکـانی‌و چ لای زانایـان و چ لای مـیرانی بابـان وبەتایبەتیش لای میرانی ئـەردەلان و تەنانـەت لای سـەرانی قاجـار-یشـەوە، بـە کەسێکی زاناو رەوشت بەرزو خاوەن هەڵوێست و دڵسۆز، سەیری کـراوەو جێگـەو رێزی تایبەتی هەبووەو پلەو پایەی مەزنیان بۆ داناوەو لەم مەیدانەشدا گـەلیٚ جـار تکای لی‌کراوە وەك ریش سپی‌و ناوبژیکار، بۆ بڕانەوەی گەلیٚ کێشەی کۆمەلایەتی‌و ئایینی، بێتـە مەیدانـەوەو قسـەی خـۆی بکـات و لای هـەردوو مـیرانی بابـان و ئەردەلانیشەوە پێشنیاری بۆکراوە، بچێتە پایتەخت و شارە گەورەکانیانەوەو لەسـەر فەرمانی غولام شاخان ـی مـیری ئـەردەلانیش، لـە ئاهـەنگێکی پـر تـەدارەکدا، بەرەسمی لەقەبی مەولەوی پێدراوە[٢]. دیسان هەر ئەم شازادیە، لەگەڵ ئەوەشدا کـە لە باوەش دایکێکدا گەورە بووە، سـەدان فرسـەخ لـەزێدو زمـانی مەولـەوی یـەوە دوورە،[٣] کەچی ئەوەندە عاشق و هۆگرو سەراسیمەی شیعری مەولەوی بووە، نـەك هەر بە دیالیکتی **گۆران** ـی، بەڵکو سەیر لەوەدایـە، بـە شـێوە زمـانی ناوچـەی تاوەگۆزی شیعری لەگەڵ مەولەوی‌دا ئاڵوگۆڕ کردووە![٤].

ئەم جێگەو رێزە ئەدەبیی‌و کۆمەلایەتییەی مەولەوی، دیاردەیەکی ئـەوەندە پـڕ سـەروەرییە بـۆ ئەدەبەکـەمان، کـە پێشـینەی نـەبووەو شـاعیرێکی ترمـان نییـە ئەوەندەی **گۆران** ئەم شکۆو مەزنایەتییەی بە خۆیەوە دیبـیٚ. سـەرەڕای ئەمـەش، ئـەوەی جێـی دڵخۆشـییە، ئـەم دیاردەیـە ئـەوەندەی تاڵەمووێـك، شـاعیرێتی‌و کەسایەتی **مەولەوی**یان نەبردووە بەرەو لەخۆبایی بوون و چاوبڕینە پلەو پلیکانـەی خۆ بەرزکردنەوە لەسەر حسابی ناوبانگ و شاعیرێتی خۆی؛ یان نەوی‌کردنی سـەری بڵندی شیعر، لەبەردەم دەربارێکدا؛ بەڵکو لەکۆکردنـەوەو هاوئاهـەنگی‌کردنی ئـەم دوو جۆرە پەیوەندییەدا، رۆژدوای رۆژ خۆشەویستی خۆی‌و شـیعری، زیـاترو زیـاتر، لەبازنەیەکی بـەربلاوتردا، قووڵـترو داکوتـاوتر بـردووە؛ بـەجۆرێك لای شـاعیران و شیعردۆستانی، بۆتە رەمزێکی درەوشاوەی ئەدەبیی، کـە شـیعر سـەرباری پەیامـە

ئەدەبییەکەیشی، لە عاست بەرزکردنەوەی چێژی چەشتنی ڕۆحیی و هونەریی، لە پاڵیشیدا لە خەم و خەونی خەڵك نزیك ببێتەوەو دەستە دەستە شیفتەی شیعر بن.

لە پەیجوورو تاوتوێکردنی ئەم دوو جۆرە پەیوەندییەی مەولەویدا، هەندێ ئاکامان دەستگیر ئەبن، کە جێی سەرنج و لێدووانی تازەن و بۆ ئەوە ئەشێن بن بە کەرەسەو هەوێنی زیاتر ناساندنی مەولەوی‌و شیعری کوردی لەو سەردەمەدا.

بۆ دەرگا خستنە سەرپشت لەسەر ئەم رازە، سەرەتا ئەبێ ئەوە بڵێم کە ئەم دیالیکتەی مەولەوی شیعری پێنووسیوە، سەدان ساڵ بەر لە مەولەوی-ش ئەدەبی پێنووسراوە؛ چونکە کۆنترین مێژینەی ئەدەبی شیعریی، زمانی کوردی، کە لەبەر دەستدایە، پاش داهاتنی ئایینی ئیسلام و راستەوخۆش لەسەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامەوە دەست پێ‌ئەکا، تا سەدەی سیانزەهەمی کۆچی، واتە: نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمی زایینی، کە ئەم دیالیکتە زمانی ئەدەبیی‌و ئایینی ناوچەی ناوەندی‌و باشووری کوردستان بووە.

بۆیە تەمەنی ئەدەبیی ئەم دیالیکتە، لەتەمەنی ئەدەبیی تێکڕای دیالیکتەکانی‌تری زمانی کوردی درێژترەو ئەگەریش خۆرهەڵاتناسانی وەکو: ئەلیکسندەر ژابا، مارتن، هارتمان، ب. لیرخ، رۆژبلیسکۆ، فیلچیفسکی‌و رۆدینکۆو..هتد؛ ئەوە بسەلمێنن کە ئەدەبی کوردی، لەسەرەتای دەست پێکردنییەوە، بە دیالیکتی باکوور دەستی پێکردبێ‌و بە تایبەتیش لە عەلی حەریری (سەدەی یانزەهەمی زایینی)یەوە. ئەوا لەم دیالیکتەدا لە سەدەی دەیەمی زایین و، رەنگە پێشتریش، کتێبی ماریفەت و پیرشالیاری زەرتوشتی پێنووسراوە [٥]، کەلە بارەی ئایینی زەرتوشت-ەوەیە. دواى ئەمیش کتێبی سەرئەنجام [٦] ی پێنووسراوە، کەلەناو خەڵکدا بە سروودی یارسان ناسراوەو کتێبی ئایینی ئەهلی هەق [٧] ە. لەپاڵ ئەمانەشدا وەك لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی (چاپی ئینگلیزیەکەیدا) هاتووە: باباتاهیری هەمەدانی-ش شیعری بە دیالیکتی **گۆرانی**، بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەری ئەهلی هەق،لەناو **گۆران**ە نەخوێندەوارەکاندا نووسیوە [٨].

ئیتر ئەم ئەدەبە بەدەم رەگ داکوتانی زیاترەوە، هەر لە بەخشین و درەوشانەوەدا بووە، کە شاعیرانی دیارو ناوداری بەر لە مەولەوی‌و سەردەمی مەولەوی-ش، هەر بەم دیالیکتە شیعریان نووسیوە، وەك: مەلا پەرێشان (سەدەی چواردەیەمی ز)،

بێسارانی (١٦٤١ - ١٠٧٢ ز)، خانای قوبادی (١٧٠٠ - ١٧٥٩ ز)، مەلا خدری رواری (١٧٢٥ - ١٧٩٠ز)، صەیدی هەورامی (١٧٨٤ - ١٨٣٥ز)، میرزا شەفیعی جامەریزی (١٧٨٥ - ١٨٤٨ز)، ئەحمەد بەگی کۆماسی (١٧٩٣ - ١٨٧٦ز)، میرزا قادری پاوەیی (١٨٣٥ - ١٩٠٧ز)و..هتد. ئەمانەو جگە لەو (٢٧) شاعیرەی کە ئی. بی. سۆن، لەو وتارەیدا سەبارەت بە شیعری **گۆران**ی لەسەری نووسیون و نمونەی لە (٧) شاعیریان هێناوەتەوە؛ کە کاتی خۆی دکتۆر سەعید سنەیی ئەم دەستنووسانەی پێشکەش کردوون و ئێستا لە مۆزەی بەریتانی پارێزراون و هەمووشیان پێش ساڵی ١٧٨٨ز ژیاون [٩].

بەم ئاوڕدانەوە خێرایە، لە مێژینەی ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم شێوە زمانە لە دێرینەیەکی هەزار ساڵ زیاترەوە، جگە لەزمانی ئەدەبیی، زمانی ئایینیش بووە. لە تەمەنی ئەم هەزارساڵ بەخشینەشدا، بێ‌پشوو بە تەوژم و تین و درەوشاوەیی هاتووەو زۆر کەم وابووە لەو تەمەنەیدا لە بەخشین کەوتووبێ. بە پێچەوانەی ئەدەبی دیالیکتی باکوورمان، کە ئەگەر لە قۆناغەکانی دەرکەوتنی شاعیرانی وەك: فەقێی تەیران (سەدەی چواردەیەمی زایین؟)و مەلای جزیری (سەدەی پانزەیەمی زایین)و ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ - ١٧٠٦ز)دا لە لووتکەدا بووبێ، ئەوا دوای ئەحمەدی خانی، ئیتر وزەی بەردەوامییو درەوشاوەیی، وەك تین و تاوی پێشینەی نەما.

بەڵام ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، بێ‌پسانەوە لە بەخشیندا بووە ئەو چەند شاعیرە **گۆران**ەی ناومان هێنان، نمونە گەلێکی کەمن، لە سەرومڕی ژمارەی زۆرتری ئەو شاعیرانەی کە لە تەمەنی ئەم هەزار ساڵەی دیالیکتەدا دەرکەوتوون. لەبەرئەوە ئەگەر بەرهەمی هەموو شاعیرە بەرزەکانی ئەم شێوە زمانە، بە شێوەیەکی زانستییانە بهێنرێنە ژێر توێژینەوەو لێکۆڵینەوە، ئەوا بۆمان ساغ ئەبێتەوە، کە ئەدەبی ئەم دیالیکتە، لە ئەدەبی دیالیکتەکانی ترمان بەتەمەنترو دەوڵەمەندترو بەربلاوترەو بە تایبەتیش ئەو ژمارە زۆرە داستان و چیرۆکە دڵدارییانەی کەبەم دیالیکتە نووسراون و لەبەردەستدان، لەچاو داستان و چیرۆکە ئەدەبیی دیالیکتەکانی ترماندا، ئێجگار زۆرن و کەم وێنەن.

ئەم بەراوردەشمان ئەگەر هەر بەرامبەر دیالیکتی کرمانجی باکوور بووبێ، هی ئەوەبووە کە دیالیکتەکانی ترمان، یان بەرهەمی ئەدەبییان زۆر کەم پێ‌نووسراوە،

یان زۆر درەنگانێ کەوتنە بەخشین و درەوشانەوە؛ وەك ئـەدەبی دیـالیکتی باشـوور (شێوەی سلێمانی)، کە بەرهەمی شیعریی شاعیرانی سێکوچکەی بابان: نالیو سالم و کوردیو هاوڕێکانیان؛ واتـە لەسـەرەتای سـەدەی نۆزدەیـەمی زاییـنـەوە، کەوتـە بەخشین و خۆنواندن.

جگەلەمەش، سیماکانی ئەدەبی دیالیکتی **گۆران**، لەچاو سیماکانی بەرهـەمی ئـەدەبی دیالیکتـەکانی ترمـاندا، زۆرتـر شـەقڵ و هـەوێنی خۆماڵییانـەو بـۆن و بەرامەی کوردەوارییان پێوە دیارە، کەلە بەکارهێنانی کێشی خۆماڵیی (کێشـی دە بڕگەیی)، لەتێکڕای بەرهەمەکانی ئەم دیالیکتـەدا دیـاردەی بەڵگەنەویسـتە، کـە بڵێـین ئـەدەبی ئـەم دیالیکتـە، تـا چ رادەیـەك هـەڵقوڵاوو گۆشـکراوی رەسـەن و کوردستانییە..بۆیە ئەڵێین ئەم دیالیکتە رەگ و ریشەی لـە مێژینەیـەکی ئێجگـار کۆندا داکوتاوەو هەر ئەمیش بووە بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی لە تەمەنی زیاتر لە شەش [10] سەدەی میرنشینی ئەردەلان دا، کردوویەتی بـەزمانی رەسمـیو ئـەدەبیی ئەم میرنشیینەو (هەر دەسەڵاتی سیاسی ئەم میرنشـینەن، ئـەدەبی بـە دیـالیکتی **گۆران**ی پێشخست و گەیاندییە لووتکەی داهێنان و گەشەسەندن [11]، بەرادەیـەك کە زەبرو دەسەڵاتی داهێنەرانەی ئـەدەبی ئـەم دیالیکتـە، هەمیشـە لـە سـنووری میرنشـینی ئەردەلانیشـی تێپـەڕاندووەو وەك **گۆران**-ی شـاعیر ئـەڵێ: (لـەکاتی شکۆیا، جار بووە، سێکوچکەی ناوەندی کەرکووك، هەمەدان و کرماشان هەمووی بگرێتەوە [12]. بۆیە ئەبینین لەنێوان ئەو (٣٨) نامەیەی مەولـەوی، کەتائێسـتا بـە چاپ گەیشتوون و ئەو شاعیرانەش کە شیعری لەگەڵ گۆڕیونەتەوە، هـەندێکیان بـۆ دۆستگەلێکن، لەدەرەوەی سـنووری ئـەم میرنشـینەن، بـەڵام لەهـەمان کاتیشـدا، نامەکانیش و شیعرەکانیش، بۆ ئـەو دۆسـتانەن، کـە ئـەدەبی دیـالیکتی **گۆران** شەرمەشـقیانەو [13]، ئەوەندەیشـی کـە ئێمـە مەبەسـتمانە، نامـە شـیعرییەکانی مەولەوی-ن، کە لەگەڵ ئەم شـاعیرانەدا هەیـەتی: ئەحمەدبـەگی کۆماسـی، مـەلا نیزام، شێخ عبدولرەحمانی داخی، شێخ حەسەنی سازانی (بولبـول)، مـەلا فـەتاحی جەباری، شێخ مۆمنی سازانی، مەلا عـەبدولرەحمانی نـەجار، مـەلا یونـس، شـێخ عەزیزی جانەوەرەیی، مەلا چراخ و زیبا خانم.

کەواتە مەولەوی هەڵگرو درێژەپێدەری پەیامێکی رەسەنی دەستاودەسـتکردووی نەوە، دوای نەوەیە؛ کە ئەم دیالیکتە توێشوویەتی. ئەم دیالیکتەش ئەوەندەی ئـەو

شەقلگرتنە پێشکەوتووەی کە بەو عومرە بەدەستی هێناوەو ئەوەندەش کـە لەگـەڵ خەڵك و زێدەکەیاندا ژیاوە؛ بۆتە پێناسەو مێژوویەکی خەڵکەکە. مەولەوی-ش لـەم مەیدانەدا کەهات، بە عەشقێکی قاڵی یەزدانیو ئەفسانەییەوە، زۆر بە ئەمانەت و ئەمەکدارییەوە، بە دەسـەڵاتێکی شـاعیرانەی کـەم وێنـەوە، شـوورەو سـنوورێکی خەیاڵیی بەدەوری ئەم دیالیکتەدا دروست کردووە، کە ئەگەر بکرێو بتوانین، نـاوی ئەنێین: کۆماری شیعری مەولەوی!، وەك چۆن ئیفلاتـۆن گۆڤـاری خـەون و ئـاواتی خۆی پێکـهێناون مەولـەوی- یـش لـەم کۆمـارەدا، بەسـەر کێـوی شـیعری لـەبن نەهاتووی خۆیەوە، وەك ئاسـکێکی سـڵۆك و بـەپارێز! بـەچاوی هەمیشـە زیـت و بێدارو بێ ئۆقرەوە..

بەدڵە راوکەو بیرەبیرەیەکی بێ ئەندازەوە.

بەهەناوێکی هەڵوەداو بێ ئارام و شپرزەوە..

کە گیان ئەکەن بە تەنووری سوورەوەبووی گرکانی ژانی شیعرپژانی بەردەوام..

هەر سات و رۆژو شەوەی بەسەر رەوەزێکی نەدیوی ئەم کێوەوە..

هەر دەمەی بەلای خەم و خەندەیەکی تازەی ناو ئەم کۆمارەوە..

شارەزاو بەئاگا، لەبچووکترین رووداوەکانی ناو ئەم کۆمارە،

هەر لە شنینەوەی چڵە وەنەوشەیەکی کاوانـەوە، تـا لەرینـەوەی چڵـە گیایـەك، راچەنیوەو داچڵەکیوە..

..شـوێن فڕینـی باڵندەیـەکی کۆچـەریی کـەوتووەو تـا گەراوەتـەوە، پـەژارەو چاوەڕوان بووە..

..گوێی لە خوڕەو قەڵبەزەی ئاوی دوورترین و تەنگترین دەربەندو گەروو بووە.ز

..شوێن مەرگ و ناشتنی پاییزانەی تاقە گەڵایەکی دەوەنێکیش کەوتووە..

..لەسەرماو سۆڵەی زستانە ساردەکاندا، توێی دەروونـی خـۆی، نـەك هـەر بـۆ مرۆڤی نیشتمانەکەی، بەڵکو بۆ نەسیم-ی نیشتمان کردووە بەلانەو ژووری گەرم:

نەسیم، پەنجەی پات ئەر سەردیی کێشان

بـدارەش نـەتۆی دڵ دەروون ریـشان

ئاشنایەتیو ئەوینی لەگەڵ سرووشتی نیشتمانەکەیدا، هەموو تەمـەن و هەسـت و شیعری داگیرکردووەو لەیەکدا توانەتەوە..بەجۆرێك وەك چۆن ئـەڵێن حـەزرەتی سـلێمان، زمـانی بـاڵندەو گیانلەبـەرانی زانیـوە، مەولـەوی- یـش ئـاوا، زمـانی

بوونەوەرانی سرووشتنەکەی زانیوەو یەکە یەکە، لە گـەڵیاندا ژیـاوە.. سـەری نـاوە بەسەریانەوەو رازی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتوون..پیاسەی هـەردان و سـەربەرزان و لای دۆستانی لەگەڵدا کردوون..تیری لە دیدەنیو تیڕوانینی بـەردەوامیان نـەخواردووەو لەهـەموو دیدەنـیو بەسەرکردنەوەیەکیشـدا، جـار دوایجـار، جوانـترو رازاوەتـر، هاتوونەتە بەرچاوی.. وەخت و ناوەخت بەسەری کردوونەتـەوە..لەبەرەبـەیاندا، کـە کازیوەی نیشتمانی دیوە؛ وەك دڵدارەکەی لەناو نوێنی خەودا ببینێ، ئـاوا هاتۆتـە بەرچاویو بەتاسەوە، سەری لە سنگ و بەرۆکە رووتەکەی کازیوە نزیـك ئەکاتـەوەو بۆنی ئەکات:

بـۆی یەخەی سـەحەر، پەی دەماخ دڵ
مـانۆ وەنەسیم، جێب جـەمین گـوڵ

..لەگەڵ کۆچی گەرمیان و کوێستانی خێلاتی جاف دا، سـەرەڕێیانی لێگرتـوون و یەك یەك سەرژماری کردوون، کامیان کەمە..ریشەی جەرگ و پەردەی دڵی خۆی بۆ کردوون بە نووشتەی چاوەزارو بە قـۆڵ و مەچـەکی کچـە جوانـەکانی جافـەوەی بەستووە..لە بچووکترین و دوورترین خەم و کۆستی ئازیزانیا، کسـپەو زام گەیوەتـە دڵی ئەم و فرمێسکی شیعریی، لە خەمبارو کۆست کەوتووەکان، زۆرترو بەسوێتر، هەڵڕشتووە..کە روومەتە سپیو سافەکانی شێخ عەزیزی جانـەوەرەیی - هـاوڕێی - ئاوڵە - دەرئەکەن، وشەکانی ئەم، روومەتی خۆیـان ئـەڕنن..! لەگـەڵ مـەحموودی یاروەیس -ی کوڕ کوژراودا، گریان و شیوەننامەی شیعری چەندان جار گریاوی ئـەم، بێبڕانەوەتر بووە.. لەپرسەی ناکامیی شێخ صەمەدی خانەگادا، زاوا ڕۆیـەی ئـەم، بە کوڵتر بووە..لە کۆتەڵی جافەکانیشدا، شـیعری ئـەم، بـۆ کوژرانـی قـادر بـەگی کەیخەسرەو بەگ، بە جۆشتر بووە..

... ئەگـەریش خـۆی نـەیتوانیبێ سـەردانی دۆسـتێکی بکـات، یـەکێك لـە بوونەوەرەکانی سروشـتەکەی راسپاردووە، کـە کارەکـەی بـۆ بکـات... لەمەشـدا زۆرترین راسپاردەکانی بەبادا ناردووە، کەلەم بوارەدا مەولەوی، تاقە شاعیرێکە، بە ئەندازەیەکی کەم وێنـە، جۆرەکـانی بـای زێدەکـەی بناسـیو شـیعری زۆریـان بـۆ بڵێ(١٤).

...یان کە دۆستێکی بەسەر ئەکاتەوە، یەکسەر لە پاڵیشیا ناوی ئـەم جێگایـە، یان رەمزێکی ئەو جێگایـە نـاو ئـەبا، کـە ژینگـەی دۆسـتەکەیەتی؛ وەك ئـەوەی

بەهەلی بزانیو بە تیرێك دوونیشان بپێکەو بپێکیو بلێ: بیری هەردووکتان؛ بیری هەموتان ئەکەم و هەردووکتان لای مـن، تەواوکەری یەکترن و یەك شتن... لەمەشیاندا دیسان وەك مەبەستی بێ، زۆربەی ئەو جێگایانە ناو ئەبات، کەلەناو کۆمارەکەیدان!...واتە ئەو شوێنانەی کە دیالیکتی **گۆران** ئەیانگرێتەوە، وەك: (بانە، ئاربەبا، سەرقەلا، کێوی ئاتەشگەی پاوە، خانەگاو پاوە، قوللەی قەزالە، کێوی شاهۆ، شاکەل، چەمی زەلم، رووباری سیروان، ئەردەلان، کێوی ئاویدەر ـ ی لای شاری سنە، مەریوان، زرێبار، کوێستانی سارالا، هەزارەکانیان، قوللەی وەیس[١٥]..هتد).

ئەمە ئەوەمان لا دووپات ئەکاتەوە، کە مەولەوی هەر ئەم کۆمارەی خۆی پێ کۆمارو نیشتمانەو هیچ جێگەیەکی تری پێ نیشتمان نییە. بۆیە کە ئەحمەد بەگی کۆماسی، بۆ ناوچەی رەشت وگیلان دوور ئەخرێتەوە، بەشین و شەپۆڕەوە، هانا بۆ سروشت ئەباو گلەیی لەدۆستەکانی خۆیو ئەحمەد بەگ (بونەوەرەکانی سروشت) ئەکات، کە ئیتر خۆیان نەڕازێننەوەو ماتەم بن، چونکە کەسێکی ناو کۆمارەکە، جێیان ئەهێڵێ:

ملان، سەربەرزان، کۆساران، هەردان
بێشەرنان، جەناح وەفاتان مەردان
چیشەن ئارایش، سەرتا وەدامان!؟
مەر خالۆم، وەعدەم سەیرتان ئامان؟
بەشینە؛ چەن چەن چنور نەکاوان
توخوا ماتەم بەن هاژەی وەفراوان!

ئەمە لەکاتێکدا، کە ناوچەی رەشت و گیلان، ئەو شوێنە ناخۆشە نییە، دڵی تیا تەنگ بێ.

بەلام بە پێچەوانەوە، کە دۆستێکی دوورکەوتەی، پێ ئەنێتەوە سنووری کۆمارەکەی، دڵ و دەروونی ئاوەدان و رۆشن ئەبێتەوەو شاگەشکە ئەبێو رۆحی ئەکەوێتە شایی... وەك چۆن بۆ هاتنەوەی شێخی بەهادین لەسەفەری حەج، ئەڵێ:

ئەماییەی کامل، نازیزەکەی فەرد،
فیدای ئامات بۆ سەفاییت ئاوەرد
خەیلێن گەرد بات، نەدیدەم دووربی

یـــــانەی چەم وێران، تەمام خاپووربی
خـــــاس بی تەشریفت هەم ئاوەرەوە،
گەرد پـــــات وەتەن ئـــــاوا کـەردەوە

ئەم لکان و نووسانە پڕ ئەوینەی، پێناسەیەکی تایبەتمەندو دەگمەنیان داوە بە مەولەوی، کە لەناو سەرجەمی شاعیرانماندا، شیعری هیچیان، ئەوەندەی شیعری مەولەوی، بۆنی نیشتمانیان لیّ نایەت... شیعری مەولەوی نوقمی خەم و خەندەی نیشتمانە.. بۆنی نیشتمانە.. وەك چۆن بەدیتنی گوڵی نێرگز، بۆنی بەهار ئەکەین، بەشیعری مەولەوی-ش، بۆنی خاکی مەولەوی ئەکەین.. ئەم بۆنەیشی ئەوەندە شاعیرانەو هونەرمەندانە، ئاوێتەو ئاخنراوی شیعرەکانی کردووە، رووخسارو ناوەرۆکی شیعرەکانی پێکەوە جۆشداوە.. لە روخساری هیچ شیعرێکیا ئایدیا هاوارو ژاوەژاوی دروشم پیا هەڵدان ناکات.. بۆیە لە شیعری سەرومڕی ئەو شاعیرانەشماندا، کە لە ریزی پێشەوەی دڵدارانی نیشتمانن، شیعری کەسیان، ئەوەندەی شیعری مەولەوی، عەشقی نیشتمانیان لەهەناویاندا هەڵنەگرتووە.. ئەگەریش هەڵیان گرتبێ؛ لەروخساری شیعرەکانیاندایە.. نەك لەسەر لەبەری ناوەرۆکدا.. چونکە کەسیان ئەوەندەی مەولەوی، شارەزای خەم و خەونینیشتمان نین.. کەسیان ئەوەندەی مەولەوی، لەنزیکەوە سەریان نەناوە بەدڵی خاکەوە، تا لێدانەکانی دڵی بژمێرن..

بۆ وێنە، شاعیرێکی پێشینەو سەودای نیشتمانی وەك ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ - ١٧٠٦ز)، سەرباری ئەوەش کە هەموو خەون و ئاواتی، سەرفرازیی گەلەکەی بووەو لەم بوارەدا شاعیرانی ترمان لەمەوە فێری دڵداری خاك بوون؛ کەچی لەتێکرای داستانی مەم و زین-ەکەیدا، کە داستانێکی خۆماڵییانەشە، بەلاّم لەباس و خواسی پەیوەندی کۆمەلاّیەتیو داب و نەریتی خۆماڵییانەدا، ئەگەر لەگەڵ شیعری شاعیرانی دراوسێکانماندا تێکەڵ بکرێ، ناناسرێتەوە..! یان شاعیرێکی وەك حاجی قادری کۆیی (١٨٢٤ - ١٨٩٧ز)، کە قوتابییەکی قوتابخانەکەی خانییەو بە: بولبولی نیشتمان ناسراوەو سەرەرای ئەوەش کە **گۆران**-ی شاعیر پێی ئەڵێ: (ئەو نیشتمان پەرستە، دڵسۆزە، کەهەر هاوارێکی شیعری، بەشی شۆرشێك ئاگرو جۆشی لەگەروو ئەهێنایەدەرێ[١٦])، کەچی ئەگەر وەك بەراورد چەپکە گولی شیعری، لەگەڵ شیعری مەولەوی، بەدوو دەستەوە

راوەگرێنێك

بگیرێ، بێ‌هیچ دوو دڵییەك، هەست ئەکەین شیعری مەولەوی، زیاتر بۆنی نیشتمانیان لێ‌دێت!.

یان شاعیرێکی وەك نالی(١٨٠٠ - ١٨٥٦ز)، کە ئاوارەو سەرهەڵگرتووی هەتا هەتایی‌و راستەقینەی پێناوی داروبەردی سلێمانی‌و قەرەداخ و خاك و خۆڵ و حەبیبەیەو لەم شەرحی دەردی غوربەتەیاندا، گەیوەتە تینی‌و دڵی وەختە ببێ بەئاوو بەچاودا بکا عبوور، دیسانەوە لەم دڵ بوونە بەئاوەشدا، شیعری ئەوەندەی شیعری مەولەوی، هەنسکی تەڕو بەسۆزو خۆماڵییانەی تێدا نییە.

یان شاعیرێکی وەك سالم (١٨٠٠ - ١٨٦٦ز)، کە ئەتوانرێ ناوی بنرێ: شاعیری سوارچاکیی بابان و لەهەمووو نەبەردەکانی نێوان بابانی‌و عوسمانییدا، ئەگەریش راستەوخۆ، خۆی بەشداری نەکردبێ، شیعری شیوەننامەی بۆ قارەمانێتی بابان نووسیوە بەداگیرکردنی میرنشینی بابان، گریانێك گریاوە، وەك **گۆران** ئەڵێ: کە هەرگیز جۆش و کوڵی دانەمرکێتەوە[١٧]. کەچی ئەمیش، فرمێسکەکانی، ئەوەندەی فرمێسکە درشتەکانی مەولەوی، لەئاوی زەڵم و سیروان ناچن!. لەم بارەیەوە دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول رایەکی نزیك بەم بۆچوونەمان هەیە، ئەڵێ: (هەرچی وەسفی سروشتە، لای خانی‌و نالی‌و شاعیرانی کلاسیکیمان، دیمەنێکی گشتی سروشتمان دێتە بەرچاو، بێئەوەی جیای بکەینەوە، کە ئەمە، سروشتی کامە ولاتە!، بەلاّم هەرچی نەخشەی سروشتە لە شیعری مەولەوی‌دا، تەواو کوردستانییە[١٨].

بۆیە ئەگەر عەڤدالی دیتنی رووی راستەقینەی خۆما بین ؛ ئەگەر شەیدای دیتنی سەراپای نیشتمان بین؛ ئەبێ سەیری ئاوێنەی شیعری مەولەوی بکەین؛ وەك چۆن ئەگەر بۆ روخسای شەمسی تەورێزی بگەڕێین، ئەبێ دووتوێی شیعری مەولانای رۆمی بۆ بگەڕێین!.

شیعری مەولەوی، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر عارفانەو سۆفیانەیە، بەلاّم بە پێچەوانەی هەموو شاعیرانی سەرتاسەری ئەم رێبازگەیەوە، کە ئەگەر جوانیی‌و خۆشەویستی خوا (کردگار)، لە شیعرەکانیان دەربهێنین، هیچیان تیا نامێنێتەوە؛ کەچی لە شیعری مەولەوی‌دا، ئەگەر ئەم کارەش بکەین و هەر شتێکی تریش دەرهاوێژین، هێشتا نیشتمان، بەهەموو کەژو کوێستان و گەرمیان و رووبارو قەڵبەزو گوڵ و سروەو درەخت و مرۆڤیەوە، لەهەموو شیعرێکی مەولەویدا،

لەهەموو بەیتێکی مەلـەوی‌دا، بـەڵکو لەهـەموو پیتێکـی مەولـەوی‌دا، بانگمـان ئەکەن و هانمان ئەدەن، خۆشمان بوین؛ چونکە لای مەولەوی، هـەموو جوانییـەکانی کردگار، لە کوردستاندایە! لە سرووشـتنی رەنگینـی خـاکی مەولەوی‌دایـە.. هیـچ شـتێك، هیـچ جوانییـەك، لـەدەرەوەی خـاکی مەولـەوی‌دا نـەبووەو نییـە.. ئـەو جوانیانـەش بـەجۆرێك لـە نیشـتماندا ئـەبینیٚ، کـە تایبەتمـەندیی خۆماڵییانـەی پێوەبیٚ.. یان بەواتەی **گۆران**-ی شاعیر (مەولەوی ئەو شاعیرە بەرزو نەمرەیە، کە هەموو بەیتێکی دیوانەکەی، کچە کوردێکی شۆخ و نازدارە، بە بەرگ و پۆیلانـەی خۆماڵی تەواوەوە[19].

لەم دیدەنیە کورتەی کۆمارەکەی مەولـەوی‌دا، بەشـوێن سـەرەداوی ئـەو رازەدا ئەچینەوە، کەپێشتر دەرگامان لەسەر کردەوەو، وتمان: ئەو دۆست و شاعیرانەو ئـەو چیاو گوندو شارانەی ناویان لەنامەو شیعری مەولـەوی‌دا بـوو، هـەموویان ئەوانـە بوون کە کۆمارەکەی مەولـەوی ئەیگرتنـەوە!. ئەمـەش پرسـیارێکمان لا دروسـت ئەکات، کە ئەگەر پێشـتریش کرابـیٚ[20]، لاوەکیـی بـوون و خۆیـان بـۆ سـۆراخ و وەڵامدانەوە، ماندوو نەکردووە. منیش رەنگـە وەڵامـی بنـبڕم نـەبیٚ. بۆیـە هـەر ئەوەندە توخنی ئەکەوم، کە دەرەقەتی دێم و ئەڵێم: لەو نامەگەلەی مەولەوی، کـە بۆ دۆستان و بەتایبەتیش بۆ شاعیرانی نووسیون، نەك هەر نامە بۆ نـالی، یـان بـۆ مەحوی، کە ئەمی دواییان لەچاو ئەوانی‌تردا، بەگیانی مەولەوی-ش نزیکەو لەگەڵ مەولەوی‌دا، سەر بەیەك رێبازگەی ئایینیشن؛ بەڵکو تاقە نامەیکیان تێدا نییە، بـۆ شاعیرێکیان نووسرابیٚ، کە بە کێشی عرووز، شیعری نووسیبیٚ!. ئەمـە لـەکاتێکدا لەپاڵ کۆمارەکەی مەولەوی‌دا، واتە: لەمیرنشینی بابان دا، کـە دراوسـێی نزیـك و تێکەڵاوی هەمەلایەنەی لەگەڵ میرنشینی ئەردەلاندا هەبووەو بەهۆی گواسـتنەوەی پایتەختەکەشیانەوە، لە قەلاچوالان-ەوە، بۆ سلێمانی‌و دەسەڵات پەیداکردنی زیاترو بەهێزبوونیان و بۆ چاولێکەرییش لـە میرنشـینی ئـەردەلان، کـە شـێوە زمـانێکی شەقڵ گرتوویان هەبووە؛ پێویسـتی بوونـی شـێوەزمانێکی تازەیـان لـە قوتابخانـە شـیعرییەکەی نـالی‌و هاوڕێکـانیدا دیوەتـەوەو سـەرومڕی ژیـانی مەولـەوی-ش، هاوکاتی سەرهەڵدان و گەرمەی بـاس و خواسـی ئـەو قوتابخانـە شـیعرییەی نـالی بووە.. کەچی بۆ وێنە: مەولەوی، کە چەند جار نامە لە هەورامانەوە، بۆ بەغدا بـۆ (محمود پاشای(٢١) جاف) ئەنووسیٚ، یان کە مەولەوی خۆی لە بەغدا بووەو لەوێوە

نامە بۆ ئەحمەد پریسی(٢٢) بۆ بناری هەورامان ئەنووسیّ؛ بەسەر سلێمانی تازە پایتەختی بابان و شاری نالیو هاورێکانیدا، باز ئەداو، لەناوهێنانی ئەو جێگایانەشدا، کە لەدوو توێی شیعرەکانیدا بەسەرمان کردنەوە؛ ناوی تاقە چیاو گوندو شارۆچکەو شارێکیش ناهێنیّ، کە لە جوگرافیای میرنشینی باباندان!.

ئەمە ئەوەمان لا ئەسەلمێنیّ، کە مەولەوی کەم و زۆر پەیوەندە ئەدەبی لەگەلّ شاعیرانی ئەم قوتابخانە تازەیەدا نەبووەو نەیویستووە بیبییّو.. بەنامەکان و بەناوهێنانی شوێنە جوگرافی یەکانیشدا دەرئەکەویّ، کەلەسەرچەمی زەلّم ـی خۆرئاوای میرنشینی ئەردەلانەوە، تا قوللەی وەیس ـی سنووری خۆرهەلاّتی میرنشینی ئەردەلان ئەبینیّ!

وەلامی ئەم پرسیارە سەختەو؛ بەو هۆیەشەوە کەتا ئێستا بەلّگەیەکمان لەم بوارەدا لەبەردەستدا نییەو ئاگاداری ئەو باس و خواسانەش نین، کە لە دانیشتنە ئەدەبییەکانی ناو مزگەوت و دیوەخانەکانی ئەو رۆژگارەدا، لەمەڕ شیعرو زمانەکەمانەوە کرابن؛ بۆیە ناچار هەر پەنا ئەبەینەوە بەر دەقی شیعریی، شاعیرانی دیالیکتی **گۆران** و ئەلّێین: ئەم قوتابخانەیە، هەموویان پابەندی پەیڕەوکردنی ئەو سیمایانە بوون، کەلە مێژەوە لە شیعری ئەم دیالیکتەدا هەبووە بە گشتیو بە تایبەتیش کێشی خۆمالّییانەو رەسەنی (١٠ برگەیی)، کە زۆرترین ئەدەبی میللیو فۆلکلۆریمانی پیّنووسراوە.. لە سەرووشیانەوە مەولەوی، کەلە هەموویان زیاتر پابەندی ئەم کێشە بووەو پێشی وابووە کە شیعری کوردی، ئەبیّ بەو کێشە خۆمالّییە بنووسریّ، چونکە خۆی کە دوو کتێبی باوەرنامەی بەزمانی بیانە، واتە: الفضیلة والفوائح ـەکەی [٢٣] بەزمانی عەرەبیو فارسی نووسوە؛ کە کێشێکی عروزەو بریتیە لە شەش جار: مُستَفعِلَنْ. کەچی کە عقیدەی (٢٤) مەرضیة کوردییەکەی نووسیوە؛ لەگەلّ ئەوەشدا کە پەیامی ئەم کتێبەش، هەمان پەیامی الفضیلة والفوائح ـە، بەلاّم چونکی ئەمیانی بە کوردی نووسوە؛ بە کێشی (١٠ برگەیی)ی خۆمالّیی دایڕشتووە.

جگە لە مانەش، چونکە شێوە زمانەکەشیان، بەری رەنج و شەونخونیی دەیان و بگرە سەدان شاعیرو روناکبیرو زانای ناسراوو گومناوی ناو ئەو تەمەنە درێژەی مێژووی کولتوری ناوچەیەکی بەرین بووە؛ بۆیە من پێم وایە کە: مەولەوی ئەو قوتابخانە شیعرییە عروزئامێزەی نالی، بەکودەتایەکی نامۆو ناوەخت زانیوە، بۆ

سەر شێوەزمانی **گۆران**ی‌و بەهیچ شێوەیەك لەکۆمارەکەی خۆیدا، تەنانەت وەك پرژی باسکردنیش، باسی نەرکردوون و جێگەی نەکردوونەتەوە. چونکە وەك وتمان هەر نیشتمانی شیعری رەگ داکوتاوی دیالیکتی **گۆران**ی پێ نیشتمان بووە.

بۆ پشتیوانیش لەم بۆچوونەمان خۆشبەختانە، ماوەیەك بەر لە نووسینی ئەم چەند لاپەڕەیە، لەماڵێکی شیعرو هونەرئامێزی شاری سنەی(٢٥) شیرینداا، دیوانێکی دەستخەتی مەولەوی-یمان دییەوە، کە روونوسی دەستخەتی مەولەوی خۆیەتی‌و پێشکەشی مامۆستاکەی خۆی: حاجی مامۆستا مینبەری -ی کردووەو لە پێشکەش کردنەکەشدا ئەوە ئەسەلمێنێ کە دیارییەکەی، واتە: شیعرەکانی، بە شێوەزمانی **گۆران** -ن، کە بەجۆرە بە فارسی، پێشکەش ئەکا:

(در خاطر محبان جای سوزش مشتاقان وآرزومندان جنانی، چه در لباس تازی و چه در لباس کرباس گورانی تفاوتی نخواهد فرمود، وبر بی التفاتی نخواهد افزود. اری - هر یکی را اصطلاحی دادەایم - هر یکی را سیرتی بنهادەایم -((٢٦). پس فقرات گویای خاموش نایب فقیر مدهوش است - یسلم علیکم وعلی من لدیکم - عبدالرحیم المعدوم)*

پەراوێز:

١- تەقەللا دیارەکانی ئەم مەیدانە ئەمانەن:

* رۆحی مەولەوی، بەرگی یەکەم: ١٩٣٥، بەرگی دووەم: ١٩٤٠، پیرەمێرد
* دیوانی مەولەوی - کۆکردنەوە لێکۆڵینەوەو لەسەر نووسینی: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس - بەغدا ١٩٦١ز.
* **گۆران**، مەولەوی‌و شیعری موناسەبەت - گۆڤاری هەولێر ژمارە (٨، ٩، ١٠) - ١٩٥٠ز.
* **گۆران**، یادی پیرەمێرد - ل٧٣ -٨٣ - بەغدا - ١٩٥١ز.
* میهرەجانی مەولەوی، کتێبی ژمارە (١)ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، بەغدا، چاپخانەی - الزمان - ١٩٨٩ز.
* مێژووی ئەدەبی کوردی - عەلائەدین سەجادی - بەغدا ، ١٩٥٢ز.

* ئەدەبی کوردیو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی - عەلائەدین سەجادی، بەغدا - ١٩٦٨ز.

* ئەنوەر قادر محەمەد - لیریکاری شاعیری گەورەی کورد: مەلەوی، ستۆکهولم - ١٩٩١ز.

* محەمەد ئەمین ئەردەلانی - دیوانی مەولەوی - وەرگێڕانی بۆ سۆرانی - بەرگی یەکەم - بەغدا ١٩٩١ز.

* کۆنگرەی مەولەوی، سەقز: ٨ تا ١٣٧٢/٧/١٠ه هەتاوی، بەرامبەر ٢٩ تا ١٩٩٢/٨/٣١ز.

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی - چاپی دووەم بەغدا - ١٩٧١ . ل٢٨١.

٣- بۆ زیاتر رونکردنەوە، ئەبێ ئەوە بڵێم کە: غولام شاخان، یەکێ لەدوا میرانی میرنشینی ئەردەلانەو لەباوکەوە کوری دووەمی خەسرەوخانی کوری ئەمانۆللاخانی گەورەی میری ئەردەلانە، کە باوکی بە خەسرەوخانی ناکام بەناوبانگەو دیسان وەك شاعیریش ئەناسرێو شیعری بەزمانی فارسی زۆرەو نازناوی شیعری والی‌یە. لە دایکیشیەوە، کوری حوسن جیهان-ە، کە (٢١)هەمین کچی فەتح عەلی شای قاجارەو ئەمیش وەکو شاعیرێکی فارسی زمان ئەناسرێو نازناویشی ام القانون-ە. بەواتا: لەسەرێکەوە رەگەزی دایکی فارسەو شیعە مەزهەبەو باوکیشی خەسرەوخانی ناکام، وەك وترا، هەر بە فارسی شیعری نووسیوەو لە سەرێکی تریشەوە ماهشەرەفخانم - مەستوورەی ئەردەلانی (١٨١٣ - ١٨٤٧ز)ی شاعیرو مێژوونووسی ناوداری کورد، زڕ

---

*سەرنج:

ئەم وتارە بەشێکە لە کتێبێکی سەربەخۆ، بەناوی (خوێندنەوەیەکی تازەی مەولەوی)، کەلە ئایندەیەکی نزیکدا بە چاپی ئەگەیەنم.. لەهەمان کاتیشدا، هەر ئەم وتارە، لەکۆنگرەی مەولەوی-یدا خوێندرایەوە، کەلە شاری (سەقز)، لەرۆژانی ٢٩ تا ١٩٩٢/٨/٣١ز-دا سازدرا.

دایکێتی، کە ئەبێتە هەویەی دایکیو ژنی دووەمی باوکێتی، کەبەسەر دایکی هاتووەو.. ئەبوایە ئەم چەند جیاوازیو هۆیە، کار لە هەستی غولام شاخان بکەن،

تا زۆر حەز لەزمانی کوردی نەکات..کەچی شیعری مەولەوی، ئـەوەندە جێپەنجـەو زەبری لەسەر هەست و ناخی غـولام شـاخان هەیـە، کـەوەك وتـرا: نـەك هـەر بـە دیـالیکتی **گۆران**ی، بـەڵکو بەشـێوەزمانی ناوچـەی تـاوەگۆزی، شـیعری لەگـەڵ مەولەویدا ئاڵوگۆڕ کردووە..!

٤- یادی مەردان - بـەرگی دووەم، مـەلا عەبدولکـەریمی مودەڕیـس - بـەغدا چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق -ل ٣٨٥ -٣٨٨ -١٩٨٣ز.

٥- دانای هەورامی - پیرشالیاری زەردەشتی، بەغدا - ١٩٦٨ز.

٦- مەشەڵلاّی سووری - سەرئەنجام - تاران ی١٣٤٤ هەتاوی.

٧- مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی سـەبارەت بـەم کتێبـە ئـەڵێ: شێوەی شیعرەکان و ناوەرۆکیان ئەیسەلمێنن کە دیالیکتی هەورامی ٨٠٠ سـاڵ لەمەوبـەر، زمانی ئایین بووە. زاری زمانی کوردی لەتای بەراوردا - بەغدا/ ١٩٨١ز - ل١٧.

٨- لیریکای شاعیری گەورەی کورد - مەولەوی - ل٣٢.

٩- مینۆرسکی، **گۆران**، وەرگێرانی ناجی عەباس، گۆڤاری گـەلاوێژ، بـەغدا، ژمارە (٥، ٦، ٧، ٨، ٩،١٠)، ساڵی ١٩٤٤.

١٠- محەمەد ئەمین زەکی: تاریخ الدول والامارات الکردیە فی العهد الاسلامی، ترجمە محمد علی عونی - القاهرە/ ١٩٤٥ - ص٢٧٦.

١١- ئەنوەر قادر محەمەد: لیریکای شاعیری گەورەی کورد، مەولەوی، ل٣٨.

١٢- **گۆران**: یادی پیرەمێرد - بەغدا - ١٩٥١ز - ل٧٨.

١٣- لـەم (٣٨) نامەیـە، تـەنیا نامەیـەك، کـە بـۆ کـاك ئەحمـەدی شـێخ-ی نووسیوەو تا ئێستا نـازانین کـە ئـاخۆ کـاك ئەحمـەدی شـێخ-یـش، بـۆ دڵنـەوایی مەولەوی، دیالێکتی **گۆران**ی خۆشویستووە، یانا!؟

١٤- بروانە ئەم نمونانە، کەباسی جۆرەکانی بایان تێدایە، بە تایبەتی نەسیم:

نەوەخت هیجران، ویـــــداعت فاما
نەوە شەماڵ دا، پەیـامت ئاما ل ١٣

ئـامـــاوە وەهار، وەهــار شــادی
بۆی عەتر نەسیم، خونچەی ئازادی ل٣٨

زایـــفیم هـــەریەند جـەحەد بـــــەرشی‌یەن
نەسیم ئـــەر بـــارۆم عەجـــایب نییەن ل٤٩

رجـــــام هـــــەن فــەردانەو گەردەلوول دا
بویـــەری نـەژێر ســـایەی رەســـوولدا ل٩٩

گـــاچۆن بـۆی نـەسیم وەرووی شـــەتـــاودا
گاچۆن گولْ نەپـــــای چۆڕەی بـــەفراودا ل١٤٦

ئـــەو ســـەبوون ســــفتەی پر داخ بیْ پەرداخ
تۆ بۆی شنۆی بـــای ئێلاخ نـــە دەمـــاخ ل١٤١

نـــەســیم بـــەس بـــویـــەر وەکۆساراندا
وەسەن شـــانـــای وەڵگ وەدیـــاراندا ل١٤٣

شـــنۆی رەشـــەبـــای زوســـــان هیجران
سەرچڵەی عەیـــشم کەردەن وەبوریـــان ل١٢٩

چۆن وەڵگ شـــادیی من وای دوریـــی لـــەیل
وەیشوم بەرد ئەو هەرد، نەو رشتەی سوەیل ل١٦٠

پـــووش ئـــایریچم جـــای نـــەسیم نییەن
هورکەردەو بەردیم تـــاوەلاش شـــییەن ل٢٧٥

چ شـــیریـــن زەڕگەر، تـــۆف هـــەوای سارد
گۆشوارە نـەگۆش نەونەمـــامـــان کەرد ل٢٧٨

شـــەماڵ ئـــەرجوم هـــەن هەی وەفیدات بام
وەســـــەرگەرد بـالْ شانای هەوات بام ل٣٠٣

١٥- بڕوانە ئەم نمونانە:

چەپـــــگەرد پەی دووریت شانا مۆرەی نەرد
وەزاهیر بـــانـەش وەبەهـــــانە کەرد ل٨

جـــە ســـەرقەلاوە مـــەگێلوون پـــەی تۆ
دەك دیدەم هەردوو صەدجار فدێت بو ل١٦

تـــانجەڕۆ ئەی چەم، ســـیروان ئـەو چـــەم
جۆشـاوی وەهەم، ئەی چەم تا ئەو چەم ل١٣١

ســـەربــەرکەر نــەســەر کۆی ئاتەشگاوە
بدیە وەمەسکەن خانـــەگا و پـــاوە ل٣٠٤

زار زارو خـــاس خـــاس، وەزار بنـــاڵە
جـــاگیر نەسەر ئەوج قوللەی قەزاڵە ل٣٠٤

دڵـــەی خـەم خەیـــاڵ، جوش ئـاوەردەوە
(مەعدوم) هەم هەوای زەهاو کەردەوە ل٢٤٣

دیـــدەم رێـــژاوە، روخســـــارم زەردەن
جەداخ یاران، پــــیران-م کەردەن ل٢٥٤

ئـــا دەور مـــدۆ وەشـــاهۆ کـــۆ-وە
وەســـزای دووریی دیـــدار تۆوە ل٣٠٩

فەضـــای ســـایەی عـەرش دانای جەلیلەن

یا بـــارەگای پاك سەیید خەلیل-ەن ل٣٥٧

وادەی خـــاو نـــییەن، وادەی شـــــکارەن
دەشــــتەکەی پای هەرد شاکەل دیارەن ل٣٧٣

گـــێچ مــــەدا ســـەبون شـــارەزوور دڵ
ســـــیروان هوناو، دەرونش گوڵ گوڵ ل٤١٨

واژواش مـــــەویـــەرد، نـــەونەمـام دەم دەم
تاف مەوەست سەراو، چەرخ زەڵم چەم ل٤١٨

خاو خاو پەی نەچیر، چـــــــەم وەنگیــــاوە
تەك مەداین وەلای کۆی ئاتەشگـــاوە ل٤٩٠

من مـــات و بیـــدەنگ، بـــێ صەداو ناڵە
یـەکێ بیم چون سەنگ قوللەی قەزاڵە ل٤٩١

ئـــیسە وە ئەڵمـــاس دووری دڵ کــــاوام
مەلاڵ بەدحـــاڵ، ئـــــەردەلان ماوام ل٤٩٢

دەی ســــــاشـــــو بوبەر نەو سوب سەحەردا
چۆن دووی هەنـــاســـەم وە ئاویدەردا ل٤٩٣

هــــانـــە بــانــــەدا، بێـــکەس کەفتەیی
دیـــاربی ئـــازار تـــۆ شنەفتەیی ل٤٩٧

ئـــایـــر ســـەنـــدەبی، جـــەگردین لاوە
پـــووشەکەی جەستەوەش وە ئاربەباوە ل٤٩٨

گێچ زرێوار هەرسم مەوج و وەردەن
سارای مەریوان تەمام هەڕ کەردەن ل٥٠٠

شەوان هام رازەن، روان هاومالّەن
(قلب الاسد)م، قەوس سارالّ ـن ل٥١٨

هەوای سەر سارالّ وەخسوس وەتەن بۆ
ئەرچی صەفای رۆح، راحەتیی تەن بۆ ل٥٢٦

وەهەر جا تەشریف تۆ ئەرزانییەن
هەر دیدە پەی تۆ، هەزارکانی‌یەن ل٥٢٩

هالّ بەدهالّ، بەدەن هالّی‌و هەوالّە
یانی های چون سەنگ قوللەی قەزالّە ل٥٣٢

ئارۆ من دەردم سەرمەشق قەیسەن
نەجدم سارای صاف پای قوللەی وەیس ـن (بەیازێکی لای خۆم)

١٦، ١٧_ یادی پیرەمێرد، وتاری مامۆستا **گۆران** ل٧٥، بەغدا، ١٩٥١ز
١٨- میهرەجانی مەولەوی ل١٠٣، بەغدا - ١٩٨٩ز
١٩- یادی پیرەمێرد- ووتاری مامۆستا **گۆران** ل ٧٨ - بەغدا ١٩٥١- چاپخانەی مەعاریف.
٢٠- میهرەجانی مەولەوی - وتاری فاتیح عبدولکەریم - ل٤٧، هەروەها لیریکای شاعیری گەورەی کورد، مەولەوی _ل ٧٥، ٧٦.
٢١- یادی مەردان، بەرگی دووەم.
٢٢- هەمان سەرچاوە.
٢٣- بروانه الوسیله فی شرح الفضیلة - بغداد - ١٩٧٢ز

٢٤- بروانــه: عــەقیدەی مەرضیــه، مەولــەوی، شــەرح و لێکدانــەوەی مـــەلا عەبدولکەریمی مودەریس، بەغدا، ١٩٨٨ز.

٢٥- مەبەست لەماڵی باوکی هونەرمەندانی ناسراو، هاورێیانم/ کاکــه هــادیو کاکه مەهدی ضیائەدینی-یە، که بــاوکی کۆچکردوویــان شــاعیر : شــێخ محەمــەد جەمیل ضیائــەدینی - ١٩٢٥ - ١٩٨٣ز-کــوری شــێخ محەمــەد شــەریف، کــوری شاعیری گەورەو ناسراوی کورد شێخ محەمەد سەلیم ناسراو به سالمی سنه، لــەژیانی خۆیدا، بەخەتێکی زۆر خۆش، روونوسی دیوانێکی مەولەوی تاوەگۆزی کردووه، که مەولەوی ئەم دیوانــەی بەخــەتی خــۆی، پێشــکەش مامۆســتاکەی خــۆی: حــاجی مامۆستای مینبەری کردووه.

مزگێنی ئەدەم به خوێنەران و شیعردۆستانی مەولەوی، که ئێستا ئــەم دیوانــه، لای منەو توێژینەوەیەکی وردو قوڵم لەسەر کردووەو ئامادەی چاپه. ئــەوەی جــێی مژدەیه لەم دیوانــەدا، نزیکــەی (٤٠)چــل شــیعر لــەم دیوانەدایــە، کەلــە دیوانــه چاپکراوەکەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەریس دا نییه.

٢٥- هــر یکــی را اصطلاحــی دادەایــم..هتــد، بەیتــە شــیعرێکی مـــەولانای رۆمی‌یه..مەولەوی لەنیازەکەی خۆی هێناویتیەوە، تا لای مامۆستاکەی، پاکانه بۆ ئەوە بکاو بڵێ: من، که به شێوەی **گۆران**ی شیعر ئەنووسم، بەهرەیەکە خــوا پێــی داوم و لەمەشدا لای خوا، جیاوازی نییه، بەهەر زمانێك بنووسم.

# نالی
# و
# مەستوورە*

مەستوورە (١٨١٣ز - ١٨٤٧ز)، کە نازناوی ماهشەرەفخانم، کچی ئەبولحەسەن محەمەد بەگ - ەو ئەگەرچی دیوانێکی شیعریی بەزمانی فارسی‌و کتێبێکی مێژوویی، دەربارەی مێژووی ئەردەلان لەپاش بەجێماوە؛ کەچی تا ئێستاش لای زۆربەی کوردناسانی خۆرهەلات و خۆرئاواو مێژوونووسان و نووسەرانی خۆشمان، زۆرتر هەروەك شاعیر باس ئەکرێ. لە کاتێکا شانازیی مێژووی فەرهەنگی کوردی، لەوەدایە کە نزیکەی ١٧٠ ساڵ لەمەوبەر، لەسەرتاسەری خورهەلاتی ناوەراستا، تاقانە ئافرەتێکە، مێژووی نووسیبێ.

هەرچەندە لەپاڵ دیوانە شیعرە فارسییەکەیدا، بڕە شیعرێکی عروزئامێزی بەزمانی کوردی-ش، بەناوی مەستوورە-وە، بلاوبۆتەوە. وەك نمونەی ئەمجۆرە شیعرانەی، کەئەمە سەرەتاکەیەتی:

گرفتارم، بەنازی چاوەکانی مەستی فەتتانت
بریندارم، بەتیری سینە سووزی نێشی موژگانت[1]

بەلام من دلنیام، کەئەو شیعرە کوردییە عروزئامێزانە، هیمەستوورە نین و دراونەتەپاڵی؛ چونکە لە لایەکەوە ئەمجۆرە شیعرانە، جگە لەوەی پیاو وتوونی، لەلایەکی تریشەوە مەستوورە خۆی، لەمێژووەکەی خۆیدا، کەلە ئاخرو ئۆخری

---

***سەرنج :**

*ئەگەر هەندێ فاکت و پەرەگرافی ئەم ووتارە و ووتاری پێشوو لە یەکتر بچن، پێویستی ووتارەکان وا بووە.*

*١ - مێژووی ئەدەلان - نوسینی : مەستوورەی کوردستانی - گۆرینی بۆ کوردی: دکتۆرحەسەن جاف و شکور مستەفا - چاپی یەکەم - بەغدا - دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی ل ٧ - هەروەها : تاریخ مشاهیر کورد - جلدی یەکەم - تالیف بابە مردۆخ رۆحانی- چاپ اول ١٣٦٤ - انتشارات سروش - ص ٣٦٧-٣٧٢*

ژیانیشیا نووسیۆتی، کەم و زۆر باسی ئەوە ناکات کە شیعری کوردی نووسیبێ، لەهەمان کاتیشا، کەباس دێتە سەر مەستوورەو ئەدەبی کوردی، لەسەردەمی مەستوورەو لە ئەدەبی باوی ئەو سەردەمەی میرنشینی ئەردەلان؛ ئەبێ ئەوەمان لەیادبێ کەئەو ئەدەبەی لەو رۆژگارەدا بەزمانی کوردی لەجوگرافیای میرنشینی ئەردەلان دا سەقامگیر بووە، ئەدەبی دیالیکتی گۆران بووە، کە بە کێشی خۆماڵیی، واتە: کەبە وەزنی هیجا (بڕگەیی) بووە. لەبەرئەوەی ئەم دیالیکتەی گۆران، زۆر لە پێش دروستبوونی شاری سنەشدا، زمانی ئایین-ش بووە. چونکە ئەگەر کوردناسانی وەکو: (ئەلیکسەندەر ژابا، مارتن، هارتمان، روژەلیسکۆ، لیرخ، فیلچیڤیسکی، رۆدینکۆو...هتد)ش، ئەوە بسەلمێنن کە ئەدەبی کوردی، لەسەرەتای دەست پێکردنیەوە، بە دیالیکتی باکوور دەستی پێکردبێ و بەتایبەتیش لە عەلی حەریری (سەدەی یانزەیەمی زایین)، ئەوا لەم دیالیکتەدا، (لەسەدەی دەیەمی زایین)و رەنگە پێشتریش، کتێبی ماریفەت و پیرشالیاری زەرتوشتی[2] پێنووسراوە، کەلەبارەی ئایینی زەرتوشت-ەوەیەو دوای ئەمیش کتێبی سەرئەنجام-ی پێنووسراوە، کەلەناو خەڵکا، بە سرودی یارسان ناسراوەو کتێبی ئایینی ئەهلی هەق-ە[3]. لەپاڵ ئەمانیشدا، وەك لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی چاپی ئینگلیزییەکەیدا - هاتووە، باباتاهیری هەمەدانی-ش، شیعری بە دیالیکتی گۆران، بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەری ئەهلی هەق، لەناو گۆرانە نەخوێندەوارەکاندا نووسیوە.[4] جگە لەو (٢٧) شاعیرەی کە ئی. بی. سۆن، لەو وتارەیدا سەبارەت بە شیعری گۆران، لەسەری نووسیون و نمونەی لە (٢٧ ) شاعیریان هێناوەتەوە، کە کاتی خۆی د. سەعید سنەیی، ئەم دەستنووسانەی پێشکەش کردون و ئێستا لە مۆزەی بەریتانی پارێزراون و هەمووشیان پێش ساڵی ١٧٨٨ زایین ژیاون.[5]

---

٢- دانای هەورامی - پیرشالیاری زەردەشتی - بەغدا - ١٩٦٨ز

٣- سەرئەنجام - ماشەڵلای سوری - چاپ اوّل - تاران ١٣٤٤

٤- لیریکای شاعیری گەورەی کورد - مەولەوی - ئەنوەر قادر محەمەد - ستۆکهۆڵم ١٩٩١ ل ٣٢

٥- مینۆرسکی - گۆران وەگێرانی ناجی عەباس - گۆڤاری گەلاوێژ- ژمارە (٥ تا ١٠) بەغدا ١٩٤٤ ز

راوەگرێنك

ئیتر ئەم ئەدەبە، لەتەمەنی ئەم هەزارساڵ بەخشینەیدا، بێپشوو، بە تەوژم و تین و درەوشاوەیی هاتووەو بەدەم رەگ داکوتانی زیاترەوە هەر لە بەخشیندا بووە، کە کۆمەڵێك شاعیرانی گەورەو ناوداری ئەدەبی کوردی، هەر بەم دیالیکتە شیعریان نووسیوە، وەك: مەلا پەرێشان (سەدەی چواردەیەمی زایین)، بێسارانی (١٦٤١ - ١٧٠٢ز)، صەیدی هەورامی(١٧٨٤ - ١٨٣٥ز)، میرزا شافیعی جامەرێزی (١٧٨٥ - ١٨٤٨ز)، ئەحمەد بەگی کۆماسی(١٧٩٣ - ١٨٧٦ز)، مەولەوی تاوەگۆزی(١٨٠٤ - ١٨٨٢ز)، میرزا قادری پاوەیی(١٨٣٥ - ١٩٠٧ز)و..هتد، کە ئەم بەردەوامییە، پێچەوانەی ئەدەبی دیالیکتی باکوورە، چونکە ئەگەر لە قۆناغەکانی دەرکەوتنی شاعیرانی وەك: فەقێی تەیران (سەدەی چواردەیەمی زایین)و مەلای جزیری (سەدەی پانزەیەمی زایین)و ئەحمەدی خانی(١٦٥٠ - ١٧٠٦ز)دا لە لوتکەدابووبێ؛ ئەوا دوای ئەحمەدی خانی، ئیتر وزەی بەردەوامیی و درەوشاوەیی، وەك تین و تاوی پێشینەی نەما.

بەڵام ئەدەبی دیالیکتی گۆران، جگە لەو تەمەنە درێژەی و بەردەوامییەشی، ژمارەیەکی زۆریش داستان و چیرۆکی دڵداری پێنووسراوە؛ کەلەچاو داستان و ئەدەبی دیالیکتەکانی ترماندا، ئێجگار زۆرن و کەم وێنەن. بۆیە ئەڵێین ئەم دیالیکتە، رەگ و ریشەی لەمێژینەیەکی ئێجگار کۆندا داکوتاوەو هەر ئەمیش بووە، بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی لەتەمەنی زیاتر لەشەش سەدەی میرنشینی ئەردەلان دا، کردوویەتی بەزمانی رەسمیو ئەدەبیی ئەم میرنشینەو (هەر دەسەڵاتی سیاسیی ئەم میرنشینەش، ئەدەبی بە دیالیکتی گۆرانی پێشخست و گەیاندییە لوتکەی داهێنان و گەشەسەندن)[٦]، بەرادەیەك کە زەبرو دەسەڵاتی داهێنەرانەی ئەدەبی ئەم دیالیکتە، هەمیشە لەسنووری میرنشینی ئەردەلانیشی تێپەڕاندووەو وەك گۆران -ی شاعیر ئەڵێ:(لەکاتی شکۆیا، جار بووەسێ کوچکەی ناوەندی کەرکوك، هەمەدان و کرماشان هەمووی بگرێتەوە)[٧]

لەکاتێکا شێوەزاری ئاخاوتنی دانیشتووانی ناوچەکانی کەرکوك و هەمەدان

---

٦ - *محەمەد ئەمین زەکی-تأریخ الدول والأمارات الكردية في العهد الاسلامي - ترجمة:محمد علي عوني- القاهرة- ١٩٤٥ ص ٢٧٦*

٧- *یادی پیرەمێرد- وتاری مامۆستا گۆران- بەغدا - ١٩٥١ ل ٧٨*

رازەگرێنك

وکرماشان، هەریەکیان بەجیا، لــە دیـالیکتی گـۆران جیـاوازترە. کـەچی ئـەدەبی دیـالیکتی بـاکوور، لەوپــەری درەوشـانەوەو دەسەڵاتیشـیا، لەسـنووری ناوچـــەی دیالیکتی خۆی تێنەپەڕاندووە.

ئەم بەراوردەشمان ئەگەر هەر بەرامبەر دیالیکتی کرمانجی بـاکوور بووبـێ، هـی ئەوە بووە، کە دیالیکتەکانی ترمان،یان بەرهەمی ئەدەبیان زۆر کـەم پیْنووسـراوە، یان زۆر درەنگانێ کەوتنە بەخشین و درەوشانەوە؛ وەك ئـەدەبی دیـالیکتی باشـوور (شێوەی سلێمانی)، کەبەرهەمی شیعریی، شاعیرانی سیْکوچکەی بابان: نالیو سالم و کوردیو هاورێکانیان؛ واتــە لەسـەرەتای سـەدەی نۆزدەیـەمی زاییـنـەوە، کەوتـە بەخشین و خۆنواندن. .و کەوتە ڕەواندنەوەو تەنگ پێهەڵچنینی سێبەری جوگرافیـای ئەدەبی دیالیکتی گـۆران، کـە چـەندان سـەدە بـوو، دەنگـی دیـالیکتی کرمـانجی باشووری کپ کردبوو، کەوەك بەڵگــە مێژووییـەکان و دەقـە ئەدەبییـە دێرینـەکان بۆمـان ئەسەلمێنن، ئەم دیالیکتـــەی کرمـانجی خـواروو لـە کاتێکیشـا کـە ئـەدەبی نووسراوی دیالیکتی گوران، لەو تەمەنە درێژەشدا سێبەری بەسەرەوە کردبوو، بەڵام ئەدەبێکی دەوڵەمەندی لە فۆلکلۆری بەیت و شیعریسەرزار، بەکێشە خۆماڵییەکان پیْ نووسرابوو.

بۆیە کە نالیو هاورێکانییان بۆ یەکەمجار، ئەم دیالیکتەیان بـۆ قوتابخانـە عـروز ئامێزەکەی خۆیان رام کرد؛ ئیتر ئــەم دیالیکتـە لـە ماوەیـەکی زۆر کورتـدا، وەك ئاگرێکی بەتین، بە ئاقاری خۆیـدا تەنییـەوەو زۆر خـێرا بـۆ گـەرمیان و کوێسـتان پەڕییەوە. کەلێرەدا پێویست ئەکا ئەوە بڵێین: هۆی خێرا تەنینەوەو گەشانەوەی ئـەم دیالیکتە بەر لە هەموو شتێك و لەسەروو هەموو شتێکەوە، (وەك چۆن دەسـەڵاتی سیاسی میرنشینی ئەردەلان، ئەدەبی بـە دیـالیکتی گـۆران پێشخسـت وگەیاندیـە لووتکەی داهێنان[٨]؛ هەر بەو جۆرەش پشتیوانی گەورەو بەهێزی مـیران و سـەرانی میرنشینی بابان بوون، کە دراوسێی نزیك و تێکـەڵاوی هەمەلایەنـەو راسـتەوخۆی ئەردەلانەکان بوون و بۆ چاولێکەریش لەمیرنشینی ئەردەلان، لەوەدا کـەوەك وتمـان: نزیکەی شەش سەدە، زمانی رەسمیو ئەدەبییان، شێوەزاری گۆران بووە؛ بۆیە مـیران و سەرانی بابان -یش، بۆ تەواوکردنی پێویستیەکانیهاوچرخانەی پایتەختە

---

٨- لیریکای شاعیری گەورەی کورد -مەولەوی - ل ٣٨

تازەکەیان، کەتازە لە قەلاچوالان-ەوە ، گواستبوویانەوە بۆ سلێمانیو لەبەر ئەوەش کە ئاخاوتنی جەماوەری میرنشینی بابان تێکرا، بەشێوەزاری کرمانجی خواروو بـوو؛ بۆیە پێکهێنانی شێوە زمانێکی هاوچەرخانەش، بۆ ئەوەی ببێتە زمانی ئـەدەبییو رەسمیـی، تایبـەت بـە میرنشـینی بابـان، بـووە پێداویسـتیەکی فەرهـەنگیو کۆمەلایەتیو ئەو بەرنامەیەی کە بۆ پێشخسـتنی میرنشـینەکەیان، لـەم پێنـاوەدا رەنگیـان بـۆ رشـتبوو؛ هـەر لـە بانگهێشـتنی زانایـانی ئـایینیو ئـەدیبانی بـە ناوبانگەوە، بۆ نیشتەجێبوون لە سلێمانی تازە پایتەختیاندا، تا خانـەقاو قوتابخانـە کردنەوە بۆیان، کە ئەم پشتیوانییە، هاندەرێکی بەگوڕ بـوو، بـۆ سەرخسـتنی ئـەم بەرنامەیە.

هەرچەندە لەپاڵ ئەم پشتیوانییەشدا، قوتابخانە شیعرییەکەی نالیو هاورێکـانیو بەتایبـەتیش نـالی، کـە هاتـە مەیدانـەوە، بـە دەسـەلاتێکی بەهرەمەندانـەی شاعیرانەوە، بە شارەزاییەکی بەربلاوەوە لە رەوانبێژیی عەرەبیدا. بـە وردەکـارییو وشەئاراییەکی پڕ پەرداخ وئارایشـتی تـازەکراوەوە، بـەلێزانیی لـەزمانی کـوردیو دەسەلاتی بەسەر شێوازارەکانی تری رێزمانی کوردیو هونـەری موتوربـەکردنیاندا، بە ئەندازەیەك کە جێپەنجـەو کـاری نـالی لـەم دیالیکتـەی خـواروودا، گەیشـتۆتە سنوورێك، بـەخۆی رەوا ببینـیو بـەم دیالیکتـە بلـێ: زمـانی خۆکـرد!.. ئەمانـە هـەمووی بوونـە هـۆی ئـەوەی لـە ماوەیـەکی مێژوویـی زۆر کورتـدا، ببێتـە شـێوەزمانێکی مەودابـەرین و ئیقلیمگـیرو سەرمەشـق، بـۆ تێکـرای نووسـەرانی باشوور، بەجۆرێك کە سەرەرای ئەوەی ئەم شێوەزمانە، لـەچاو شـێوەزمانی گـۆران دا، زۆریش ساوابوو؛ بەلام بە پێچەوانـەی دیـالیکتی گـۆران -ەوە، کەبـە هـەرەس هێنانی میرنیشنی ئەردەلان، زۆر بەخێرایی پووکایەوە، کـەچی ئـەدەبی دیـالیکتی باشوور، دوای هەرەس هێنانی میرنشینی بابان-یـش، کەلەگـەڵ هـەرەس هێنـانی ئەردەلان دا هاوکات بوو-، نەك هەر نەلەقی؛ بەلکو لـەتین و تـەوژم و هـەلچوونی خۆی نەکەوت و بـە سەرانسـەری ئـەو ناوچانەشـدا تەنییـەوە کـە پێشـتر ئـەدەبی دیالیکتی گۆران دەسەلاتی مێژینەی بەسـەریاندا هـەبوو. تەنانـەت بـەجوگرافیای گۆران نشینەکاندا بەرادەیەك تەنییەوە، کەوەك ئێستا ئەبینین، نووسەرانی ناوچـەی هەورامان-یش، هەر بە دیالیکتی باشوور ئەنووسن.

بەلام لە رۆژگاری ژیانی مەستوورەدا، هێشـتا ئـەدەبی دیـالیکتی گـۆران، لـە

گوڕوگوژمی خۆیدا بەردەوام بووەو بەتایبەتیش کەژیانی مەستوورە، هاوسەردەمی پۆلێك لەو شاعیرە گەورانەی ئەم دیالیکتە بووە، کە پێشتر ناومان هێنان و لەناویشیاندا مەولەوی تاوەگۆزی، کەبە دەسەڵاتی شاعیرانە خۆی، ئەدەبی دیالیکتی گۆران-ی گەیاندە چلەپۆپەی داهێنان و زیاتر گەشانەوەی و لەهەمان کاتیشدا کە مەولەوی و مەستوورەش هەردووکیان هاوجوگرافیای ئەو هەرێمەن، کە دەسەڵاتی ئەدەبی دیالیکتی گۆران؛ نەك هەر سێبەری بەسەرەوە کردووە، بەڵکو هەر لەو بنەماڵەیەشدا، کە مەستوورەی تیا ژیاوە، شاعیری وەك غولامشاخان -ی زرکوری مەستوورە، شیعری بە دیالیکتی گۆران نووسیوەو نامەی شیعریی لەگەڵ مەولەوی‌دا ئاڵوگۆڕ کردووە.

بۆیە بێ‌سێ‌ودوو ئەڵێین ژیانی مەستوورە ئەکەوێتە سەردەمێکەوە، کەدوو قوتابخانەی ئەدەبیی تێکرا جیاواز، بەدوو شێوە دیالێکتی جیاواز، لەدوو ناوچەی هاووسنووردا، کەوتوونەتە ململانێ‌و بگرە گەرمەی سەرەتای تەنگ پێهەڵچنینێکی ئاشکرا؛ کە دیاردەییەکانی ململانێ‌و تەنگ بەیەکتر هەڵچنینەکە، لەسەرومری بنچینەو روخسارو ناوەرۆکی هەردوو قوتابخانە ئەدەبییەکەدا، بەزەقی‌و بە تایبەتیش لەشیعرەکانی مەولەوی‌و نالی‌دا، رەنگیان داوەتەوە؛ کەهەر یەکەیان نمونەیەکی زۆربالای هەردوو قوتابخانە جیاوازەکەن. چونکە ئەگەر بۆ بەڵگەی سەلماندنی ئەم بۆچوونە، لەنامە شیعرییەکانی مەولەوی- کەلەدیوانە چاپکراوەکەیدان- و لەو ٣٨ نامەیەی ورد ببینەوە، کەلە بەرگی دووەمی یادی مەردان دا، چاپکراون، بۆمان دەرئەکەوێ کەمەولەوی بەم هۆیەوە کە میراتگری ئەدەبێکی تەمەن درێژی تان وپۆخۆمالییە، بەهیچ جۆرێك دۆستایەتی‌و نامەگۆڕینەوەی لەگەڵ ئەو شاعیرە کوردانەدا نییە، کە شیعرەکانیان بەکێشی عرووز نووسیوەو نالی سەردەستەیانە.

تەنانەت مەولەوی لەگەڵ شاعیرێکی گەورەی سۆفی‌و نەقشی مەشرەبی وەك مەحوی‌شدا، هیچ سەروبەندێکی نییە، لەکاتێکا کە هەردووکیشیان سەر بەرێبازگەی نەقشبەندی -ن و خەلیفەی بنەماڵەی شێخ عوسمانی تەوێڵەن. هۆیەکەش هەر ئەوەیە کە مەحوی- ش شاعیرێکی سەر بە قوتابخانە شیعرییەکەی نالی‌و هاورێکانێتی.

بەهەمان پێودانیش، کەلە سەرتاسەری شیعرەکانی نالی ورد ببینەوە، بۆمان

دەرئەکەوێ کە پلارو توانج و تەشەرێکی زۆر ئەگرێتە ئەوانەی سەر بە تصوف-ن. کەوەك ئەشزانین تێکرای شیعری شاعیرانی دیالیکتی گۆران، شیعری تەسەوف و عیرفان-ە.جگە لە چەندان نمونەیتر، لەشیعری هەردوو قوتابخانە ئەدەبییەکە بەرامبەر بەیەکتر؛ وەك ئەو هەموو هەڵوێست وەرگرتنەی مەحوی، بەرامبەر ئەوانەی کە هێرش ئەکەنە سەر تەسەوف و عیرفان، یان ئەو لاقرتیو گاڵتەپێکردنە بێپەردەیەی سالم (١٨٠٠ - ١٨٦٦ز)، بەدیالیکتی گۆران و لەشکری ئەردەلان-یش، کە ئاخاوتنیان گۆرانە-ە؛ وەك نمونەی ئەو قەسیدە درێژەی بەبۆنەی لە ئەستەمولْ هاتنەوەی عەبدوڵلاْ پاشای کوری سلێمان پاشای بابان، بۆ بەدەستەوەگرتنەوەی میرنیشینی بابان، لە سلێمانی پایتەختدا، کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

تیرەوەش دێمە گوزەشت و عەهدی نیسان هاتەوە
بلبلی بێدڵْ لەدەوری گوڵْ با فیغان هاتەوە

تا ئەگاتە:

کەڕوفەر با کەم بکا، والی بە فەوجی چێش کەرۆ!
پشت بەندی لەشکری وەندات و جافان هاتەوە(٩)

لەبەسەرکردنەوەی پێشینەی ئەم دوو قوتابخانە ئەدەبییە جیاوازەو ناوهێنانی مەستوورەدا، یەکسەر ئەو قەسیدەیەشمان بیر ئەکەوێتەوە، کەنالی لەسەر مەستوورە نووسیوێتی. چونکە هەر کەناوی مەستوورە، یان نالیمان دێتە یاد، دەم ودەست ئەو قەسیدەیەشمان دێتەوە یاد.

ئەم قەسیدەیەش لەسەردەمی نووسینەوە تا ئێستا، هەر جێی باس و خواس بوەو هەر زووش شاعیری گەورەی سابلاخ: وەفایی (١٨٤٧ ز- ١٩١٦ز)و دواتریش عەبدوڵلاْ بەگی میسباح ئەلدیوان (١٨٦٠ - ١٩١٢ز)، چاویان لێکردووەو هەریەکەیان شیعرێکی بە پێودانی ئەم قەسیدەیەی نالی نووسیوە؛ کە شیعرەکەی وەفایی، قەسیدە بەناوبانگەکەی شیرین تەشی دەڕێسیێەو میسباح ئەلدیوان-یش شیعرێکی درێژی پێنج خشتەکی نووسیوە؛ کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:

دوێ شەو، شەوی شەنبە، کە لە شەمع و مەهو ئەختەر
ئاراستە بوو سەحنی سەراپەردەی ئەخزەر

شایانی باسە، شیعرەکەی مسباح ئەلدیوان ئەوەندە ویستویەتی شوێن پێی نالی

(وەرگەڕێ)

هەڵبگرێو لاسایی بکاتەوە؛ جگە لەوەی هەر بە خەون دەست پێئەکات، دیسان بەهەمان وەزن، ناوی مەستوورەشی ئاخنیوەتە شیعرەکەیەوە:

گەنجینەی مەستوورە بەبێ خازەن و گەنجوور
ئاییینەی بللوورە، بەبێ سنعەتی مزدوور

تا ئەو رادەیەی لەهەندێ جێگەیتری ئەم قەسیدەیەدا، وێنەی شیعریی‌و قافیەکانی هەمان شیعری مەستوورەی نالی بەکاردێنێ:

وەك تازە هەڵوژی کەلەناو دوولقەدابێ
وارێك گوشرابێ، کەلە دوولاوە قوپابێ
هێندێکی قوپابێ و کەمێکی قەڵەشابێ
قەڵشانی، نەوابێ کەبەچاو فەرقی کرابێ

لەم یەك دوو ساڵەی دواییشدا، کاك رێبوار سیوەیلی، بەبۆچوونی خۆی، لێکۆڵینەوەیەکی لەدوو توێی نامێلکەیەکدا، سەبارەت بەهۆی نووسینی ئەم قەسیدەیەی نالی نووسیوە.

ئێمەش، بۆ ئەوەی بتوانین لە نزیکترەوە بڕوانینە ئەم قەسیدەیەی نالی‌و هۆی نووسینی؛ پێویستیمان بەزیاتر نزیکبوونەوە هەیە، لەمێژووی ژیانی مەستوورەو لەنزیکەوە ناسینی سەردەمەکەی.

وەك لەسەروتریشەوە وتمان سەردەمی ژیانی مەستوورە، هاوسەردەمی مەولەوی بووە، کە مەولەوی-ش هاوسەردەمی نالی بووە، کەبەهەمان شێوە مەستوورەش ئەبێتە هاوسەردەمی نالی. بەڵام مەستوورە، ٣ ساڵ لەنالی بچووکترە، چونکە نالی ساڵی (١٨٠٠ز) لەدایك بووەو مەستوورە، ساڵی (١٨٠٣ز) لەدایك بووەو هەر لەشاری سنەشدا، لەباوەشی بنەماڵەیەکی بەرێزو ناودارو دەسەڵاتداردا گۆشکراوە؛ کە محەمەد ئاغای باپیری مەستوورە لەسەردەمی دەسەڵاتداریتی ئەمانوڵڵاخان (١٧٧٥ - ١٨٢٤ز)ی گەورەدا، هەمەکارەو راوێژکاری ئەمانوڵڵاخان و ناظری صندوقخانەی(١٠) میرانی ئەردەلان بووە. کە جار جارەش بەهۆی ناکۆکی‌و ناتەبایی ریزەکانی ناو میرنشینەکەو بنەماڵەی ئەردەلان-ەوە، لەئاکامی هەراو ئاژاوە کەوتنەوەدا، محەمەد ئاغای باپیری مەستوورە-ش، لەو هەرایانە گلاوەو زۆر جاریش بۆتە دەستەی نەیارانی ئەمانوڵڵاخان و دووبارە ئاشتبوونەوەیان. کەدوای مردنی ئەمانوڵڵاخان و هاتنە سەرکاری خەسرەوخان-ی

کوری (١٨٠٠ ز- ١٨٣٤ز)، ئیتر دەلاقەی ئەو ناکۆکییانە گەورەتر بوون و بنەماڵەی مەستوورە-ش وەك جاران کەوتوونەتە ناو یەکێك لە بەرەکانی ئەو پشێوییەو بەتایبەتیش بەرەی ململانێو سەنگەرگرتن لە دەسەلاتداریێتی خەسرەوخان؛ کەلەئاکامدا و بۆ دڵنەوایی‌کردنی بنەماڵەی ئەبولحەسەن خان-ی باوکی مەستوورەو بن بڕکردنی هەڵوێستی دوژمنانەیان و ئاشتکردنەوەی ئێجگارییان، لەساڵی( ١٨٢٨ ز) دا، مەستوورە لە تەمەنی( ٢٥) ساڵیدا دراوە بە خەسرەوخان(١١). بەلام تەمەنی پێکەوەژیانیان لەگەڵ خەسرەوخان -ی هاوسەریا، (کە منالیشی لێی نەبوە) هەر شەش ساڵی خایاندووە، چونکە خەسرەوخان لەتەمەنی ٣٤ ساڵیدا، بەنەخۆشی جەرگ کۆچی دوایی ئەکا. کە ئیتر دوای جوانەمەرگبوونی، ناوی ئەنێن: خەسرەوخانی ناکام و؛ مەستوورەش هەر لە حەرەمسەرای بەجێماوی خەسرەوخان دا، ماوەی ١٣ ساڵی‌تر، بەبێوەژنیی ئەمێنێتەوە. تالەساڵی (١٨٤٧ز)دا، دوای ئەوەی چرای میرنشینەکەیان بەرەو کوژانەوە ئەچێو بنەماڵەی ئەردەلان دەسەلاتیان لێ زەوت ئەکرێ، ناچار لەگەڵ کۆچێکی بەکۆمەڵی زیاتر لە هەزار کەسیدا، بەرێگەی مەریوان و شارەزووردا روو لە میرنشینی بابان ئەکەن، بەلام هێشتا بەدەم رێگەوە ئەبن، کە نەخۆشی رشانەوەیان تێدابلاو ئەبێتەوەو نەخۆش ئەکەوێو پاش ئەوەی ماوەیەکی کورت لە سلێمانی ئەمێنێتەوە؛ ئەمیش وەك هاوسەرەکەی جوانەمەرگ ئەبێو لەتەمەنی ٤٤ ساڵیدا کۆچی دوایی ئەکاو لەگردی سەیوان-ی سلێمانی ئەنێژرێ(١٢).

قەسیدەکەی نالی دوو بەشە؛ کەبەشی یەکەمیان داخوازیو پرسیاری مەستوورەیەو بەشی دووەمیشیان هەڵوێست و وەلامی نالی‌یە بۆ مەستوورە.

لەیەکەمین مەسرەعی سەرەتای قەسیدەکەدا نالی وەك ئەدیب -ێك، نەك شاعیرێك، ناوی مەستوورە دێنێ، کە بەجۆرە دەست پێ‌ئەکا:

مەستوورە، کە حەسناو ئەدیبە، بە حیسابێ!

هاتەخەوم ئەمشەو، بەچ نازێك و عیتابێ

کە ئەمەش بەڵگەیەکی زیندووە، دژی ئەو بۆچوونەی مەستوورە، وەك شاعیرێك ناوئەبەن. چونکە مەستوورە -ش خۆی، لە مێژووەکی خۆیدا (مێژووی ئەردەلان)، کەم و زۆر باسی ئەوە ناکا، کە شیعری بە کوردی نووسیبێ.

بەلام دوای ئەوەی نالی وەك ئەدیب -ێك ناوی مەستوورە دێنێ؛ ئیتر دوای

خوێندنـەوەی یەکـەمینجاری هـەموو قەسـیدەکە، بۆمـان روون ئەبێتـەوە، کـە مەسـتوورە هێشـتا کچـە! لـەکاتێکا وەك مەسـتوورە خـۆی بومـان ئەگێرێتـەوە، لەتەمەنی ٢٥ سـاڵیدا، پـیێ هاویشـتۆتە حەرەمسـەرای خەسـرەوخان -ەوە!.. و تەمەنی ٢٥ ساڵیش بۆ تاقیکردنەوەی ئەدەبییو بەتایبەتیش بـۆ کچـە کوردێکـی وەك مەستوورە -ی (پتر لە ١٧٠ ساڵ لەمەوبـەر، لەشـارێکی لەرادەبـەدەر داب و نەریت راگرو سەرپۆش لەسەری وەك سنە-دا(١٣)..)، کە ئەگەریش سـەروبەندێکی لەگەڵ کاروباری ئەدەب دا هەبووبێ، کە هێشـتا کچـەو لەماڵـە باواندایـە؛کـەمتر دەنگی ئەگاتە دەرەوەی ماڵی باوکی. بۆیە هێشتا بۆ ئەوە ناشـێ، کـە شـاعیرێکی گەورەیوەك نالی پێی بڵێ: ئەدیب!.

کەواتە ئـەبێ گوڵـی گەشانەوەی گوڵـی ئـەدەبیی مەسـتوورە، لـەدوای ئـەو قۆناغەوە بووبێ، کە بۆتە هاوسەری خەسرەوخان؛ یان بە واتایەکی تر، ئەبێ لەدوای ئەو کاتەوە بێت کە ئەبێتە میرکچێکی میرنشینی ئەردەلانیو میرانی ئـەردەلانیش و بەتایبەتیش خەسرەوخان -ی هاوسەری مەستوورە یەکێك بووە لەو میرانـەی کـە دۆستی نزیك و راستەقینەی شاعیران و هونەرمەندان بووەو هەمیشە دیوەخانەکـەی پڕ بووە لـە ئـەدیبان و هونەرمـەندان و شـەوانە، تـا درەنگـانێ کـۆری ئـەدەبییو هونەریی، لە ماڵەکەیا سازکراوە.(١٤).

لەبەر ئەوە من دڵنیام ئەم قەسـیدەیەی نـالی، هـی قۆنـاغی دوای شـووکردنی مەستوورەیە. کە ئەبێ هەرواش بێ. چونکە نالی لە کاتێکـا کـە باسـی کچێنـیو رابردووی مەستوورە ئەکا، ئەڵێ:

دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ
چەند خوێن کە رژابێت و چ خوێنی نـەرژابێ

لـەم رووەوە، کـاك فـاتیحی مـەلا عەبدولکـەریمی مودەریـس -یـش، ڕازێکیشاراوەی لەدوو توێی بەیتێکی بە توێکڵی ئەم قەسـیدەیەی نـالیدا هەسـت پێکردووە، کە ئەبێتە بەڵگە بۆ ئەم بۆچوونەمان و بەڵگەکەش نیشانی ئـەدات کـە مەستوورە، لەکاتی نووسینی ئەم قەسیدەیەدا، ژنی خەسرەوخان -ە، نـەك هێشـتا کچ بێت. کە ئەمە بەیتەکەیە:

شـەو نائیم و قائیم عەلەمی بابی رضابێ
بێدیدە هەڵستێ، بە مەقەل عەینی عەسابێ

کە بابی ڕەزا، باوکی ڕەزا قولیخان -ش ئەگەیەنێ، کەکوڕە گەورەی خەسرەوخان بووە، لە ژنە فارسەکەی: حوسن جیهان -ی کچی فەتح عەلی شای قاجار. کەواتە: کۆکردنەوەی ناوی مەستوورە، لەگەڵ ڕەزادا، ئەوە ئەگەیەنێ کە مەستوورە لەو سەردەمەدا ژنی خەسرەوخان بووە.[15] لەهەمان کاتیشا ئەبێ ئەوە بزانین کە:ڕەزا قولیخان -ی کوڕە گەورەی خەسرەوخان-یش، لەساڵی (١٨٢٣ز)دا لەدایك بووە. چونکە کە خەسرەوخان -ی بابی ڕەزا کۆچی دوایی کردووە، ڕەزا قولیخان، تەمەنی (١١) ساڵان بووە[16]. کەوەك لە قەسیدەکەی نالیدا دەرئەکەوێ، هێشتاخەسرەوخان -یش لە ژیاندایە؛ واتە هێشتا خەسرەوخان، بابی ڕەزایە. کە بە گوێرەی ئەم مێژووە، ئەبێ کاتی نووسینی قەسیدەکەی نالی، لەنێوان ساڵانی (١٨٢٨ - ١٨٣٤ز) بێت.

هەرچەندە لەوەشدا کە نالی وەك ئەدیبێك ناوی مەستوورە دێنێ، بەلاّم جۆرە لاقرتێو گاڵتەپێکردنێکیشی تیایە.چونکە نالی وای لە قەڵەم ئەدات کە گوایە: خەڵك وای دائەنێن کە مەستوورە ئەدیبە!!

بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کە گاڵتە بە ئەدیب بوونی مەستوورە ئەکا؛ لەهەمان کاتیشدا لە سەرتاسەری قەسیدەکەو بگرە لە هەموو بەیتێکیشدا ستایش و گەورەیێو دەسەلاّتدارێتیو شکۆی کەسایەتی مەستوورە باس ئەکاو، ئەوانەش کە دەستنووسی کەشکۆڵە دێرینەکانی دیوانی نالی -یان نووسیوەو خوالێخۆشبوو فاتیحی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس -یش، کەدیوانی نالی ئامادەی چاپکردووە، هەر پێیان وایە کە قەسیدەیەکی ستایش ئامێزی مەستوورەیە. چونکە (تێکرا لە چوارچێوەی پیاهەڵ وتن و شان شکۆ پێدانا دارێژراوە)[17]

دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ

چەند خوێن کە ڕژابێت و چ خوێنی نەرژابێ

کەواتە ئەبێ مێژووی نووسینی قەسیدەکە، هەروەك چۆن وتمان هی دوای شووکردنی مەستوورە -یە؛ لەهەمان کاتیشا هی پێش ئەو سەردەمەیە کە بنەماڵەی میرنیشینی ئەردەلان، دەسەلاتیان لەدەستدا نەماوەو بەناچاریو بەکۆمەڵ، ڕوویان لە میرنیشینی بابان کردووە. کە دیارە ئەم سەردەمەش زۆر کورتەو ئەوەندەی بەبەرەوە نەبووە مەستوورە ماوەیەك لە سلێمانی پایتەختی بابانەکاندا بژیو لەوێ لە دیوەخانانی میران و کۆڕو دانیشتنی ئەدەبیدا، لەگەڵ

نالی‌دا سەرو پەیوەندێکیان هەبووبێ. بەڵکو وەك زانیمان مەستوورە، لەم کۆچە زۆر نالەبارەدا، نەخۆش و ئاوارەو لێقەوماو بووە؛ کە داب و نەریتی کوردەواریش، رێگە بەوە نادا لەمجۆرە کاتانەدا قەسیدەی وا دەربارەی ئافرەتێکی بێدەرەتان و میوانی وەك مەستوورە بنووسرێ. چونکە مەستوورە وەك خۆی لە مێژووەکەی خۆیدا ئەیگێرێتەوە: هەر کە گەیشتبوونە شارەزووروو پێیان ناوەتە سنووری میرنیشینی بابانەوە، عەبدوللا پاشای کوری سلێمان پاشای میری ئەو کاتەی بابان (رێو رەسمی پێشوازی لێکردنیانی بەجێگەیاندووە)[١٨]

کە وتیشمان مێژووی نووسینی قەسیدەکە، لەنێوان ساڵانی (١٨٢٨ز -تا پێش ١٨٣٤ز)دایە، ئەوا مەستوورە میرژنەو لە لووتکەی دەسەڵات و نازو نیعمەتدایە. هەر بۆیەش سەرتاسەری قەسیدەکە، باسی خەون ێك ئەکاو.. خەونیش گومرکی لەسەر نییە.

بەهەمان شێوە، نالی -ش لە قەسیدەکەیدا، کەباسی خۆی ئەکات وەك کەسێکی گەورەو بەتواناو بلیمەت و بەدەسەڵات، ئاماژە بۆخۆی ئەکا:

هەر مەسئەلە بیکرێ، کەبە تۆ شەرحی کرابێ
مومکین نیە کەس دەخلی بکا، چین و خەتابێ
ئەم شاریحی تەشریحە، دەبێ هەیئەتی چابێ
هەم شاریح و هەم جاریح و موضیحە گوشابێ
رێی حورمەت وبێحومەتیی هەرگیز نەکوتابێ
چەند ئاوی رژابێت و چ ئاوێ نەرژا بێ

لەبەرئەوە ئەبێ نالی‌ش کاتێ ئەم قەسیدەیەی نووسیبێ، کەلەوپەری لەخۆرازی‌بوون و دەسەڵاتی شاعیرانەو بەخۆنازیندایەو..هەر ئەو سەردەمە بێت، کە نالی‌ش هێشتا ئاوارەبوون و لێقەومان و دوورکەوتنەوەی لەخاکی نیشتمان نەچەشتوەو لەنیشانەکانی بەخۆنازینەکانیشیدا دەرئەکەوێ کە نالی وەك تەمەنیش، هێشتا لەهەرەتی لاوێتی‌و لەخۆراپەرمون و گەشەو هیوای ژیانایە. بە پێچەوانەی ئەو چەند شیعرەیەوە، کە لە ئاوارەییدا نووسیونی‌و بەئاسانی بۆن و بەرامەی پەککەوتن وبێ دەرەتانییان پێوە دیارە. وەك نمونەی ئەم چەند شیعرەی:

وەی کە روزەردی (مەدینە)و روسیاهی (مەککە) خۆم
دەرکراو و دەربەدەر، یارەب دەخیلی عەفووی تۆم ل٢٩٩

راوەگزنگ

ئەی تـــازە جەوان! پـــیرم و ئوفتـــادەو کەوتـــووم
دەستێ بدەرە دەستی شکستەم، کەبەسەرچووم ل٢٦٤
تاماوە حەیاتم قوربانی وەفاتم

یان کەلە شام -ەوە بۆ سالم -ی هـــــاوریێ ئەنووسێ:
زارم وەکو خیـــلال و نـــــــەحیفم وەکو خەیـــالٚ
ئایا دەکەومە زارو بەدلٚدا دەکەم خوتور؟ ل١٩٦

بۆیە بـــۆ بـەراورد راگرتنــی هـەردوو سـەردەمی ژیـانی نـالیو مـەسـتوورە، -کەهاوسەردەمی یەکترن - و ئەو رۆژگارەش کەوەك وتمان نالی-ش ئەم قەسـیدەیەی تیا نووسیوە، سەردەمی شـکۆی کەسـایەتی مەسـتوورەیە، لەلایـەك و لەلایـەکی تریشەوە سەردەمی گەشانەوەی شاعیرێتی نالییە، کەوەك ئاکام، خودی قەسـیدەکە ئەو پرسیارەمان لا بەجێئەهێلێ:

بۆچي نالی ئەم قەسیدەیەی لەسەر مەستوورە نوسیووە؟!

لەوەلامدا ، بەو هۆیەوە کـە بـاس و خواسـەکانی نـاو دیوەخانـان و دانیشـتنە ئەدەبیەکانی ئەو رۆژگارەمان لەبەر دەستانیە؛ هەر ئەوەندەمان لەدەست دێت,شوێن لێکدانەوەو بۆچوونی خۆمان بکەوین و بلێین پێش هەر لێکدانەوەو بۆچوونێك ئـەبێ ناسینەوەی نالی، لە پەنجەرەی شیعرەکانی خۆیەوە دیاردی بکەین و لە سـەرلەبەری شیعرەکانیشـیدا، ئـەم ئەنجامگیرییـەمان دێتـە بەرهەسـت، کـەنالی سـەرەرای شاعیرێتیو دەسەلاتی داهێنەرانەی دەگمـەن و کـەم وێنـەی، لەهـەموو بوارەکـانی شیعردا؛ بەلام نالی مرۆڤێکـی خوێـن گـەرم و دلٚ و هەسـت ئێجگـار زۆر ناسـکە؛ بەرادەیەك کە بچووکترین و ناسکترین ئازاردانی؛ گـەورەترین ئـازاری پێگەیشـتووە هەلچووەو هاتۆتە دەنگ. کە ئەم دیاردیـە لای مـەحوی -ش هەروایـە. بـەلام لای شاعیرێکی گەورەی وەك مەولەوی بە پێچەوانەوەیە. واتە نالی بچووکترین نیشانەی درشت و زبـری دەوروپشـتی، هەسـتی رووشـاندووەو ئـازاری پێگـەیاندووەو بـەدەم ئازاریشەوە هەستی خۆی بە شیعر دەربڕیوە؛ بە تایبەتیش بەرامبەر ئەوانەی دلە پڕ شیعرەکەیان رەنجاندووەو ویستوویانە لەشکۆی شاعیریو لەشـکۆی کەسـایەتی کـەم بکەنەوە:

ئەم ســـــەرسەری بازانە، کەوا هەمسەری بوومن
موشکیل بـگەنە ســـاعیدی شاهێکی وەکو من ل٣٣١

شیعری خەڵکی کەی دەگاتە شیعری من بۆ ناسکی!
کەی لە دیققەتدا، پەتك دەعوا، لەگەڵ هەودا دەکا؟ ل١٠٧

کەس بە ئەشعارم نـــەڵێ خۆکوردیە، خۆکردییە،
هــــەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی تالبی مەعنا دەکا ل١٠٧

ئــــەو گەوهەری نوکتە، کەلە نالی دەدزن، خەڵق
ئـــاوی نییە، وەك ئـــاگری بێشـــــەوقی دزانە ل٤٨١

لێم حــــەرامە دانەو و ئاوی حەمـــــاماتی حەرەم
من کە بازی دیدە بازم، نەك شـــەوارەی دەستەمۆم ل٣٠١

..ئەم نموونانە و نموونەی زۆرتری لەم بابەتەی نالی، ئەوە ئەسـەلمێنن کـە ئەگـەر چەند وەلاٚمێك،بۆ هۆی نووسینی ئەم قەسیدەیە هەبێ؛ ئەوا یەکێك لـەو وەلاٚمانـە، ئەوەیە کە بڵێین: ئەشێ نالی لە ئاکارو قسەو توانجێکی مەستوورە بێزار بووبێ‌و بەو جۆرە نالی وەلاٚمی دابێتەوە!..ئیتر ئـەو ئاکـارو قسـەو توانجـەی مەسـتوورە چۆن بووبێ‌و لەکوێ‌و کەی وتبێتی‌و لەچ دیدارو کۆرو کۆمەڵێکا، لەگەڵ نالی‌دا،یـەکتریان دیبێ..یانا؟!..ئەمانە هەمووی جێی پرسـیاری بـێ وەلاٚمـن. چونکـە وەك پێشـتر وتمان: دیوەخانی خەسرەوخان -ی ئەردەلان و، دواتریش (دوای مردنی خەسرەوخان)، هەمان دیوەخان هەر مەڵبەندو ژووانگـەی کـۆری ئـەدیبان و هونەرمـەندان بـووەو دیسانیش هەر لەشاری سـنە-ی پایتـەختی ئـەردەلان -دا، مزگـەوتی بـەناوبانگی دارالاحسان -یش، کەلەسـەر فـەرمان و لەسـەردەمی ئـەمان ولاٚخـان -ی گـەورەو خەزووری مەستوورەدا دروسـتکراوە؛ مەڵبـەندێکی درەوشـاوەی ئـایینی‌و زانسـتی بووەو زانایان و ئـەدیبان و رووناکبـیران، لەهـەموو لایـەکی کوردسـتانەوە روویـان تێکردووە. ئیتر ئەگەر نالی‌ش وەك زۆر لـەو ئـەدیب و شـاعیرانە، رێـی کەوتبێتـە دیوەخانی خەسرەوخان، یـان مزگـەوتی دارالاحسـان و لەلایـەن خەسـرەوخان، یـان مەستوورە -ەوە رێزی شیاوی خۆی، وەك پێویست لێ‌نـەگیرابێ‌و دڵـی رەنجێندرابـێ؛ ئەمەشیان جێی لێوردبوونەوەیە. یان وەلاٚمی ترە بۆ پرسـیارە زۆرەکـان، کـەل بـەم بوارەدا بەڵگەو نمونەی شیعری نالی -مان لەبەر دەستدا نیە؛ ئاماژە بۆ ئـەوە بکـەن

کەلە سنەدا ژیابێ. بە پێچەوانەی سالم -ی هاوڕێی نالی‌یەوە، کەوەك لە دوتوێی شیعرەکانیدا دەرئەکەوێ، ماوەیەك بە ئاوارەیی لەسنەدا ژیابێ‌و بەخەمێکی زۆرەوە، لەزۆر شیعریدا، باسی ئەو رۆژانە ئەکا.

دیسان وەلاّمی تریش بۆ بەردەم ئەم پرسیارانە ئەوەیە کەوەك بە شیعرەکانی نالی‌دا بۆمان دەرئەکەوێ، نالی لەسەران و میرانی بابان -یش نزیك بووەو دۆستایەتی لەگەڵ سلێمان پاشای کوری ئەورەحمان پاشای بابان و دواتریش لەگەڵ ئەحمەد پاشای کوری سلێمان پاشای بابان دا هەبووە. چونکە شیعری زۆر بەکوڵ و بەسۆزی بۆ کۆچی دوایی یەکەمیان و لەسەر تەخت دانیشتنی دووەمیان نووسیوە، کەئەمە سەرەتای نمونەی ئەو شیعرانەیە:

تا فەلەك دەورەی نەدا -سەد کەوکەبی ئاوانەبوو
کەوکەبەی میهری موبارەك، تەلعەتی پەیدا نەبوو ل٣٧٠

هودهودی دڵ، حەپسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامێن گیری شاهی ئاسەفی ڤانی دەکات ل١٠٥

هەروەها شیعری بۆ سوپاکەی ئەحمەد پاشای کوری‌سلێمان پاشای بابان نووسیوە، کە بەمجۆرە دەست پێئەکا:

ئەم تاقمە مومتازە، کەوا خاسەیی شاهن
ئاشوبی دڵی مەمـلەکەت و قەلبی سوپاهن ل٣٤٠

ئەم دۆستایەتیەش لەگەڵ ئەم میرانەدا، ئەوەمان بەبیردا دێنێ، کەزۆرجار لەکاتی هەڵوێست وەرگرتنی ئەم میرانەدا، بەرامبەر بە رووداوێك، یان بەرامبەر بە میرێکی تر؛ بەتایبەتیش بەرامبەر بە میرانی ئەردەلان، - کەهەندێ جاریش بەیەکدا هەڵپژاون -، وایان لە نالی کردبێ، بۆ پشتیوانی لەمیرانی بابان، بەنیازی سووکایەتی کردن بەرامبەر بەمیران و سەرانی ئەردەلان، ناوی ئافرەتێکی ناوداریان بهێنێ؟!. چونکە لەم بوارەدا، نەك هەر نالی، بەڵکو هاورێکانیشی لەروانگەی بەرگری‌و خۆشەویستی میران و میرنشینی بابان -ەوە کەوتوونەتە سەنگەری بەرەی بابان و هەڵوێست وەرگرتن لەتێکرای رووداوەکانی ئەو رۆژگارە؛ وەك نمونەی ئەو شیعرەی سالم، کە پێشتر نووسیمان و ئەو شیعرەی شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ - ١٩٠٩ز) کە سەبارەت شەرێکی نێوان عەبدوللە پاشای بابان و رەزا قولیخان -ی

کوری خەسرەوخان -ی میری ئەردەلان، نووسیویێتیو بەلاقرتیەوە باسی لەشکری ئەردەلان و بە ستایشەوە باسی سەرکەوتنی سوپای بابان ئەکا:

که عەبدوللا پـاشا لـەشکری والی سنەی شڕکرد

ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنج و شەش، طفیلی دەبوستان بوو

بەلاّم ئەو وەلاّمی لەبارتر، بۆ سەرجەمی ئەوپرسیارانە، لەو بوارەدایە کە لە پێشەکی ئەم چەند لاپەرەیەدا ئاماژەمان بۆ کرد؛ ئەویش بواریململانێ و تەنگ بەیەکتر هەلّچنینی هەردوو قوتابخانەی جیاوازی ئەدەبی گۆران و دیالێکتی باشووره؛ کەلە قوتابخانە شیعرییەکی نالیو هاورێکانیدا خۆی ئەنوێنێو نالیسەردەستەی ئەو قوتابخانەیەو ئەوململانێو زۆرانبازییە دژوارەیە،کە سەردەمی ژیانی مەستوورەش، هاوکاتی سەرهەلّدان و گەرمەی باس و خواسی ئەم قوتابخانە شیعرییەی نالی بووەو هەلّبژاردنی ناوی مەستوورەش، لەلایەن نالییەوە، بۆ سووکایەتی پێکردنی میران و سەرانی ئەردەلان بووە؛ کە باوەش و پەناو سێبەری دێرینەو ڕاستەوخۆی ئەدەب و ئەدیبانی دیالێکتی گۆران بوون و.. لەمەش زیاتر، بۆ ئابڕووبردنیان بووە، کەڕاستەوخۆ سووکایەتی بەناوی ئافرەتێکی بەناوبانگ و بەشان وشکۆی وەك مەستوورە بکا. کەبەرای من مەستوورە، ڕەمزی سەربلّندیو ناوبانگی ئەو کاتەی میرانی ئەردەلان بووە؛ چونکە جگە لەوەی بنەمالّەی مەستوورە هەمیشە ناودارو دەسەلاّتدارو سەرکەش بوون. لەهەمان کاتیشدا مەستوورەش خۆی، خانمێکی هێژاو هەلّکەوتوو بووە. هەر بۆیەش بەسەر حوسن جیهان -ی کیچی فەتح عەلی شای قاجاردا، کە یەکەمین هاوسەری خەسرەوخان بووە؛ بۆتە دووەمین هاوسەری خەسرەوخان، کەدیارە ئەگەر مەستوورە شایانی ئەوە نەبوایە، ئەوا لەقکردنی پلەوپایەی حوسن جیهان،هەروا شتێکی ئاسان نەبووە؛ کەلەو ڕۆژگارەدا فەتح عەلی شای قاجار، تاقانە شایەك بووە، لەسەرتاسەری خۆرهەلاتی ناوەڕاستدا، حسابی گەورەو تایبەتی لەسەر کراوە.

جگە لەوەی لایەنی گرنگیش لەکرداری نالیدا، ئەوەیە کە زۆر بە دەگمەن و دژوار، ناوی کەسێك لە شیعرەکانیدا بهێنێ، مەگەر ئەو کەسە زۆر ناودارو گرنگ بێت. چونکە لەو قەسیدە درێژەشدا، کەلە شام -ەوە بۆ سالم- ینووسیوە؛ ئەگەر سالم خۆی، بەو قەسیدە درێژە، وەلاّمی نالی نەدابایەتەوە، نەمانئەزانی کە ئاخۆ قەسیدەکەی نالی، بۆ سالم -ە، یانا ؟!.. ئەگینا نالی خۆی، لە قەسیدەکەدا، ناوی

کەسی نــەهێناوە. بۆیــە ئەگــەر مەســتوورەش، زۆر گــەورە نەبوایــە، نــالی نــاوی نەئەهێنا. چونکە وەك وتمان نالی زۆر باش مەستوورە ئەناسیێو ئەزانێ کە:

دەعوای ئومەرا، چەندە لەسەر تەختی کرابێ
چەند خوێن کە رژابێت و چ خوێنی نەڕژابێ!

سەقز
زستانی / ١٩٩٤

# عەتای نەهایی
# لەگێژەنی تەنگانەی سەردەم دا

که ئەڵێین: بەرهەمی ئەدەبیی‌و هونەریی؛ مەبەستمان لەوەیە که ئەو بەرهەمە، ئەو دەقە مەودای چەندین خوێندنەوەی جۆراوجۆرو جیاواز، لەخویدا کۆ بکاتەوە.

کەچی بەداخەوە سەرتاپای دەقە هونەریی‌و ئەدەبییەکانمان، هێشتا هەر بەو تێگەیشتنانەوە لە بیرەوەریماندا ئەژین، کەلە رۆژگاری لەدایکبوونیاندا، تێگەیشتن بۆ ئەدەب و هونەر چۆن بووبێت، یان خۆمان چۆنیان تێگەیشتووین؛ ئێستاش هەر بەو دیدو هەست و چەش و لێکدانەوانە، پێشوازییان لێئەکەین و قسەیان لەسەر ئەکەین. واتە: چەشی ئەدەب و هونەرییشمان بەجۆرێك پەروەردە بوون وەك، ئەدۆنیس ئەڵێت: هەر جارەی بتەوێ دەق -ێکی ئەدەبیی بخوێنێتەوە، وا هەست ئەکەیت دائەبەزیتە ناو گۆڕێکی پێشتر ئامادەکراوو ئیتر خۆت بۆ ئەو شتانە ئامادە ئەکەیت که خەڵکی‌تر، پێشتر وتوویانە. که ئەمەش چەشی ئەدەبیی‌و هونەریی، لە جێگەیەکی چەقبەستوودا راگرتووەو مەودای بیرکردنەوەو چێژوەرگرتنی تازەی لەبەردەم هەست و پشکنین و دیتنەوەی جوانییە شاراوەکاندا لێگرتووین. لەکاتێکا دەق -ی هونەریی‌و ئەدەبیی، گیان و جەستەیەکی زیندوون و هەمیشە حەزیان لەوەیەو چاوەڕێی ئەوە ئەکەن بە جۆرێك سەیر بکرێن، وەك ئەوەی زەریایەك بن..وەك ئەوەی جوولانەوەیەك بن..یان دیسان وەك ئەدۆنیس ئەڵێت: کە بچیتە ناودەق-ێکەوە، وا هەست بکەیت چوویتە ناو ئاسۆیەکەوە

هەرچەندە ئەو ئاسۆیەی دەقێکی هونەریی -ئەدەبیی، لە خەیاڵ و مێشکماندا (لەزەینماندا) بەرپای ئەکات، لەهەموو روویەکەوە جیاوازترە لەو ئاسۆیەی دەقێکی تری ئەدەبی - هونەریی دروستی ئەکات. چونکە لە هەر یەکێك لەو دەقانەدا، تەقەڵلایەکی جیاواز، زەینمان ئەورووژێنێ. که ئاکامی وروژاندنەکە پێمان ئەڵێ: دەقەکە، لەدیدی داهێنەرەکەیەوە تەقەڵلای دۆزینەوەی راستی (حەقیقەت)ی داوە. که ئەم راستی‌و حەقیقەتەش، مەرج نییە لای تەنیا نووسەرێکیش هەر یەك جۆر بێت، بەڵکو ئەشێ هەر یەك نووسەر، لەچەند بەرهەمێکی جیاوازیا، چەند تەقەڵلایەکی جیاوازی بۆ دۆزینەوەی چەند جۆرە راستی‌و حەقیقەتێك دابێ. چونکە ئەو حەقیقەتەی ئەدەب و هونەر عەقڵیێتی؛ بەردەوام روخساری خۆی ئەگۆرێ. کە

ئەم خۆگۆرینەش، جگە لەوەی ئاقارو سـنووری نییـە، لەهـەمان کاتیشـدا مانـای جۆراوجۆری هەیە. بۆیە رەنج و تەقەللای سەدان و هەزاران ساڵەی ئەدەب و هونـەر لەم پێناوەدا، بێبڕانەوەیەو بۆ لەمەودواش و هەتا هەتایە، بێبڕانەوە ئـەبێت. لەبـەر ئەوەی تێکۆشانی ئەدەب و هونەر، بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت، تێکۆشانێکە بـەدوای حەقیقەتێکی نادیاردا. کە ئەمە پێچەوانەی زانستە. چونکە ئەوەی ئـەو پەیامـەی ئەدەب و هونەر، لەگەران و پشکنینی بەردەوامدان بـۆ دۆزینـەوەی، جەستـەیەکی نییە؛ واتە: شتێکی بەرجەستە نییە. بۆیە ئەو پشکنین و گەرانەی لە دەقێکدا پێـی ئەوترێ: راستیو حەقیقەت، لەراستیدا راستیو حەقیقەت نییە، بەڵکو جۆرێکە لـە جۆرەکانی گەران و پشکنین، بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت.

کەواتە ئەدەب و هونەر، خاوەنی راستیو حەقیقـەت ـێکـی نـەگۆرو چەسپاوو سەقامگرتوو نین. بۆیە هەر کەسێك بیەوێ لە دەقێکدا حەقیقەت بدۆزێتـەوە، وەك ئەوە وایە شوێن تراویلکە کەوتبێ. ئەمـەش گەوهـەری هـەرە بـاڵاو راسـتەقینەی ئەدەب و هونەرە؛ کـە ئـەدەب و هونـەری بـاڵاو زینـدوو بتوانـن بـەدەم سـۆراخی حەقیقەتەوە، بەدەم گەرانی بەردەوامەوە بۆگەیشتن بە حەقیقەت و لـەم دڵەراوکـەی گەیشـتن و نەگەیشـتن ـەدا، لـەدوو توێـی خۆیـاندا، نوقمـی سـیحرو ئەفسـونی سەراسیمەییو راچەنین و موچرك و خرۆشانمان بکەن. بەجۆرێك هەموو هەستـەکانمان پێکەوەو لەیەك کاتدا، بهەژێن و بوروژێن و لەهەمان کاتیشدا هەمووشـیان لەگـەڵ شوێن تراویلکە کەوتنی حەقیقەتی دەقەکەدا، بەجیاواز بۆ خۆی بکەوێتە سـۆراخ و گومبوون و پەرتبوونەوە؛ کە بە تێکرایان لە ئاسۆیەکی بێسنووری زەیندا بکەونـە پشکنین و گەرانی تـر، لـەدەرەوەی دەقەکـەدا. بەواتەیـەکی تـر: هەستەکانیشـمان لەگـەڵ شـوێن تراویلکـە کـەوتنی دەقەکـەدا، ببنـە تراویلکـە ! ببنـە پرسـیارو پرسیارەکەش دەیان پرسیاری تری لەپشـتەوە بێـت. جگـە لـەوەی کـە ئـەم بزاڤـی میتافیزیکایەی نێوان دەق و خوێنـەر، نێـوان دەق و بینـەر، کـە بـەردەوام بـەرەو بیرکردنەوەی بێسنوور جڵەوکێشـمان ئـەکات؛ لـە پاڵیشیا بـەردەوام و لەهـەموو دووبارە و سێبارە دیتن و پیاچوونەوەیەکیا، ماناو حەقیقەتی تازەترمان لەمێشـکدا بۆ دروست ئەکات. کەبەمەش ئەوەندەی فکر ـهزرمان بەرەو نادیار پەرت ئـەکات، ئەوەندەش بیرکردنەوەمان فراوانترو جیاوازتر ئەکات. واتە: دەقی تازە، بیرکردنەوەی تازەش لەگەڵ خۆیدا ئەخولقێنێ.

بەمجۆرە، ئەگەر لەگەڵ خۆماندا بسازین کە حەقیقەتی ئەدەب و هونەر ئەمەیە؛ ئەوا بەوەش قایل ئەبین کە هەموو دەقێکی سەرکەوتوو، حەقیقەتی ناو دەقەکانی پێش خۆی ئەسرێتەوە. واتە: کودەتای تازە، بەسەر کودەتا پێشینەکانی خۆیدا ئەکات و تەقەللای تازە بۆ دۆزینەوەی حەقیقەتێکی تری تازەو شاراوە، ئەدات، کە پێشتر دەقێکی تر پەی پێ نەبردووە. بۆیە هونەرمەندێکی وەك پاپلۆ پیکاسۆ لەم بارەیەوە ئەڵێت: خولقێنەری دەقێکی تازە، خولقێنەری جیهانێکی تازەیە، کە خودی خولقینەرەکە، یاساو بەرنامەی تازەش، بۆ جیهانە تازە دۆزراوەکەی خۆی بنیات ئەنێ.

لەبەر ئەمە، کاتێ خولقێنەری دەقێك، خۆی بۆ لەدایکبوون و خستنەوەی بەرهەمێکی تازە ئامادە ئەکات، هەرگیز ئەو یاساو سنوورو سیستەمانەی لەیاد نییە، کە پێشتر خولقێنەرانیتر، تەنانەت خۆیشی، یاساو بەرنامەو شێوازیان بۆ خولقاندنی ئەدەب و هونەر دروستکردووە، بەڵکو ئەو کاتەی بەرهەمێك ئەخولقێنێ، ئەو کاتە وا هەست ئەکات هیچ یاساو بەرنامەیەك، هیچ شێوازێك، هیچ پشکنینێکیتر، پێش ئەو نەبووەو ئەگەریش هەبووبێ‌و ئەگەریش مرۆڤایەتی دەستکەوتی فەرهەنگیی بە دەست هێنابێ، هێشتا ئەو دەستکەوت و سەروەرییە فەرهەنگییانەی بیری مرۆڤ بەدەستی هێناوە، چەندیش مەزن بن، هێشتا داهاتوو ئەوەی بە بەرەوەیە، مرۆڤ بیر لەو تەقەللایانە بکاتەوە، کەتا ئێستا رووناکبیریی پێی نەگەیشتووە..چونکە ئەگەر تاقیکردنەوەی پێشینەکانیش لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نەمربن، بەلاّم هێشتا دوا تاقیکردنەوە، دواتەقەللا، کۆتایی نەهاتووەو خەلاّتی دوا سەرکەوتنیش بەهیچ دوا تەقەللاو دوا تاقیکردنەوەیەك رەوا نەبینراوەو نەبەخشراوە.

بۆیە ئەو خولقینەرە مەزنانە، هەمیشە وا بیر ئەکەنەوە کە حەقیقەتی پشکنین، حەقیقەتی داهێنان، حەقیقەتی جوانیی، هێشتا نەدۆزراوەتەوەو ئەبێ تاقیکردنەوەی تازەو رەنجی تازە بۆ دۆزینەوەیان بدرێ.. لێرەشەوە بەم کاری سەرکێشیی‌و چاو قایمییە تازانە، پێناسەی تازەگەریی ـش سەرهەڵئەدات. کە ئەگەر وردتریش پێناسەی تازەگەریی بکەین، ئەوا ئەڵێین: بریتییە لەکۆی ئەو کەرەسەو خواستەمەنی‌و رەمزو جیهانبینیی‌و میعمارسازییە نوێیەی بۆ یەکەمین جارو بۆ یەکەمین تاقیکردنەوە، لەسەرتاپای دەقێکدا، هەموو هەستەکانمان

پێکەوە، هەستی پێئەکەن. کە ئەم دەقە، ئەم پێناسەیە، بۆ هەتا هەتایە لەگەڵ خۆیدا هەڵئەگرێو هەمیشەو هەمیشەش هەر زیندووە.

خۆ ئەگەریش ئەم تاقیکردنەوە تازانە، جیاوازییان لەگەڵ یەکتریدا نەبووایە، ئەوا ئەبوایە هەموو شیعری شاعیرانی جیهان، کەسەرومڕ هەموویان باسی خەم و خەونی مرۆڤ ئەکەن، لەیەك بچوونایە. هەر بەو جۆرەش هەموو چیرۆك و رۆمان و تابلۆی وێنەکێشان و ئاوازی مۆسیقاو..هتد، لەیەك بچوونایە. بەلاّم تاقیکردنەوەی هیچ دەقێکی نەمر، لە تاقیکردنەوەی هیچ دەقێکی‌تر ناچێو کاتێکیش ئەڵێین لەیەك ناچن، مەبەستمان لەو تایبەتمەندیو تازەگەرییە هەمیشەییەیە، کەلە هەموو رۆژگارێکا لەگەڵ خۆیاندا هەڵیئەگرن. بەواتە: کە ئەڵێین تاقیکردنەوەی نالی نەمرە، مەبەستمان ئەوەیە کە ئەو تاقیکردنەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا کە تاقیکردنەوەی رۆژگارێکی بەسەرچووە، بەلاّم بە سەرچویەکی زیندووە، واتە رابوردوویەکی ئایندەیە. واتە: بەردەوام و لەهەموو سەردەمێکدا، خوێندنەوەی تازەو بۆچوونی تازەمان ئەداتێ. هەر بەو جۆرەش تاقیکردنەوەی مەولەوی تاوەگۆزی و گۆران و..هتد.

لێرەوە هەر بەو جۆرەی چاوەڕێو حەزی پێئەکەین ئەو ئاسۆیەی لە دەق ـێکدا رووبەری فکر ـهزرمان بەرین و بەرینتر بکات؛ هەر بەو جۆرەش لەسەر ئێمەی خوێنەرو بینەری دەق ـێك پێویستە ئەو بایەخ و دیدەی دەقێکی دیاریکراوی پێئەنرخێنین، ئەبێ لەهەموو روویەکەوە جیاوازتر بێت لەو بایەخ و دیدەی دەقێکی تری پێئەنرخێنین. بەمانا: ئەودیدەی نالی پێئەنرخێنین، ئەبێ جیاواتر بێت لەو دیدەی سالم، یان وەفایی،یان.. یان چیرۆکنووسێکی پێهەڵئەسەنگێنین. بەمەش کۆی هەستەکانی جوانیناسی خۆمان شیرینترو قووڵترو دەوڵەمەندتر ئەکەین. کە ئەم کارە لە مەیدانی فەرهەنگ بەگشتیو بەتایبەتیش لەمەیدانی هونەرو ئەدەب دا، زۆر بەسەختیو بەگران و درەنگ ئەتوانین بە سەریا زاڵ بین، چونکە لەهەڵسەنگاندنی دەقێکی هونەریی ئەدەبیی‌دا، هەمو هەستەکانمان بەشداری نرخاندنەکە ئەکەن، ئەوسا ئەو ئاسۆ بێ سنوورەمان لا دروست ئەبێ. بەلاّم لە هەڵسەنگاندنی تازەگەرییە خێراکانی پیشەسازییدا، رەنگە ئەوەندی هەستی بینین (چاو)، بەشداری راستەوخۆ ئەکات، ئەوەندە هەستەکانی ترمان بەشداری ناکەن. بۆ وێنە: لە یەکەمین دیتنی دوا مۆدێلی ئۆتۆمبیلێکدا، زۆر بە زوویی چاومان

ئاشنای روخساری دەرەوەی ئۆتۆمبیلەکە ئەبێت و ئیتر دوای ئەم یەکەمین دیتنە، لەهەر جێگەیەکی تردا، هەمان مۆدێلی ئۆتۆمبیل ببینینەوە، یەکسەر ئەیناسینەوە. کەچی لە دیتن و خوێندنەوەی یەکەمین بەرهەمی هونەریی - ئەدەبیی کە بە شێوازێکی تازەتر نووسرابێت، هەموو هەستەکانمان پێکەوە لێی ئەسڵەمێنەوەو تادوای چەند جار دیتن و خوێندنەوەی؛ ئەوسا وردە وردە، هەستەکانمان بەرودوا، لەگەڵیا رام و هۆگر ئەبن و ئەتوانن ئاشنایەتی لەگەڵدا دروست بکەن.

هەر لەبەرئەمەشە هەموو ئەو بزووتنەوە ئەدەبییو هونەرییانەی کە تازەگەران، لەسەرەتادا تووشی گەلێك دەردەسەریو کەندو کۆسپ دێن و زۆر بە زەحمەت و تا دەرەنگانێکی درەنگ ئەتوانن جێگەی خۆیان لەناو خوێندەواراندا بکەنەوە.

رەنگە لێرەدا کەسێك بڵێت: ئەمجۆرە دەقانە، هزرمان بەرەو درەوەی واقع و نامۆییو گومبوون و سەرلێشێوان ببەن و تووشی وەرسیو بێ‌هیواییو بێزاریمان بکەن لە واقعی ژیان!.

لەوەلامدا ئەڵێم: پەیامی ئەدەب و هونەر، دڵدانەوەی مرۆڤە بۆ بێزار نەبوون لە واقع؛ هاندانی مرۆڤە بۆ خۆراگرییو نەبەزین، بەرامبەر ئەو واقع-ەی هەمیشەو هەمیشە، مرۆڤ حەز بە گۆرینی ئەکات. بۆیە پەیامی ئەدەب و هونەر، باسی واقع و نیشاندانەوەو دووبارە وێنەکێشانەوەی واقع نییە؛ بەڵکو بزواندن و ئامادەکردنی هەموو هەستەکانی مرۆڤە، بۆ گۆرینی واقع. پێشنیاری تازەیە ئەخرێتە بەر هزرمان، تا لە هەڵبژاردنی پێشنیارەکاندا هزرمان سەرپشك بێت.

هەر لەبەر ئەمەشە لەسەرەتای مێژووەوە، مرۆڤ بە بێئەوەی دەسەڵات لەدەست خۆیدا بێت، ئەو میتۆلۆژیاو سەرگورشتە ئەفساناوییانەی خۆش ئەوێت، کە تیایاندا پاڵەوان لە واقع دا هەڵکەوتوون و ئەو زوڵم و زۆردارییو ستەمەیان لەناو بردووە کە بوونەتە مایەی ئازارو چەوسانەوەی مرۆڤ لە هەموو روویەکەوە. بۆیە ئێستاش لەناو رۆمان و چیرۆك و شانۆنامەو فیلمی سینەماییدا، ئەو پاڵەوانانەی خۆش ئەوێت، کە خۆیان ئەکەنە قوربانی بۆ داهاتوویەکی بەختەوەرو چاکتری مرۆڤایەتی. واتە: واقع ئەگۆرن. کەواتە بەبێئەوەی بەخۆمان بزانین، بۆشاییەکی گەورە لە دەروونماندا هەیە، هەر تەنیا بەو خەون و خۆزگانە پڕ ئەبێتەوە کە بالاترن لە واقع. ئەمەش خوازیارە شاراوەکانی دەروونی مرۆڤە، کە هەر خۆرسك، خەون و

خۆزگە بە گۆڕینی واقع و جیهانەوە ئەخوازێ.

خۆ ئەگەر هەندێجار، لە فیلمی سینەمایی‌و ڕۆمان و چیرۆکیشدا، ئاکاری هەندێ پاڵەوانمان پێ خۆش بێت کە ناویان لێنراوە: نموونەی واقعی؛ لەراستیدا ئەوانەش نموونەی واقعی نین و وێنەی ناو واقع نین؛ بەڵکو ئەو مرۆڤە نموونەییانەن کە کۆمەڵێك خۆزگەی کۆمەڵایەتییان لە پاڵەوانەکانیاندا خەست کردۆتەوەو خۆزگەو خواستەکانی کۆمەڵیان پێوە بەستوونەتەوە. لەبەر ئەوە ئەگەر پێمان وابێت باڤل ـی پاڵەوانی دایك ـی ماکسیم گورکی، کە پێی ئەوترێ شاکاری واقعی، لەراستیدا نموونەیەکی واقعی نییە، بەڵکو نموونەیەکی هەڵبژاردەی خەیاڵی مەزنی ماکسیم گۆرکی‌یە، کە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگای ئەخاتە ئەستۆ.

کەچی بەداخەوە هەندێ نووسەر، بەلاسایی‌و چاولێکەریی ئەمجۆرە شاکارانەو بە بانگەشەی ئەوەی گوایە نموونەی واقیعی لەناو کۆمەڵگا هەڵئەبژێرن، دێن فۆتۆکۆپی‌یەکی زۆر چڵکن و وەسفی درێژدادڕی واقع ئەنەخشێنن و بە شێوازێکی ئێجگار دواکەوتوو، بەناوی ئەدەبی ریالیزمی‌و هونەری واقعی‌یەوە نیشانمان ئەدەن! کە لە راستیدا ئەم بەرهەم و کارانە، ئەوەندەی دواکەوتوویی نووسەرەکانیان نیشان ئەدات، ئەوەندەش سووکایەتیە بە خوێنەران.

بۆیە پەیامی ئەدەب و هونەر، ڕێنمایی کردن و جڵەوگرتنی خەون و خەیاڵی کۆمەڵایەتییە، لە سنووری ئێجگار تەنگکراوەکانی واقع و دەربازکردنی ئەو خەون و خەیاڵە، بۆ دەرەوەی واقع. کە دەرەوەی واقع ـیش جێگەیەکی دەستنیشاکراو نییە، بەڵکو ئەو جێگە نادیارەیە کە خەون و خەیاڵی بۆ دەرباز ئەکرێ‌و ئەو جێگەیەش جیاوازترە لە جێگەی واقعی راستەقینە. واتە جێگەیەکە کە،دیاری ناکرێ‌و سیمایەکی ئاشکرای نییەو ناچێتە ژێر ئەو دەسەڵاتە کە بەرنامەو سیستەم بۆ واقعی راستەقینە دائەنێن. کەواتە هەروەك ناچێتە جێگەیەکی دیاریکراوەوە، لەهەمان کاتدا ناچێتە ناو زەمانێکی دیاریکراویشەوە. هەر بۆیەش پێشتر وتمان: ئەدەب و هونەری سەرکەوتوو، هەمیشە تازەو لەهەموو زەمانێکیشدا زیندوون. کەلیرەدا بەکارهێنانی ناهوشیارانەی زاراوەی کۆن و تازە بەرامبەر ئەدەب و هونەر، کارێکی نەشارەزایانەو نارەوایە؛ چونکە وتمان دەق ـی زیندوو، هەمیشە تازەیەو کۆن نابێت. بەواتەیەکی تر: کۆن، ئەو بەناو دەقانەن، کەنەك دوێنێ‌و ئەمڕۆ، بەڵکو ئەگەر سبەینێ ـ یش بنووسرێن، هەر مردوون. چونکە هەر لەسەرەتاوە هەوێنی

ژیان لە جەستەیاندا نەبووە. واتە: هەر زوو، پێش ئەوەی لەدایك بن ، لەبارچوون.

لەمەوە ئەڵێین: پەیامی ئەدەب و هونەر، خستنەگەڕی هەموو تواناکانی هەستەکانمان و خەیاڵمانە، بۆ بیرکردنەوە بە پێچەوانەی واقع ئاساییەوە؛ بۆ گۆرینی واقع. کە ئەم بیرکردنەوەی پێچەوانەی واقعەش، هەر لەناو گێژەنی ناکۆکییە بەردەوامەکانی خودی واقع دا سەر هەڵئەدات، نەك لە دەرەوەی واقع. بۆیە ئەگەر ئەدەب و هونەری زیندوو، چەندان و چەندان پێناسەیان هەبێ؛ ئەوا یەکێکیان هەڵئەگرێ بڵێین: ئەدەب و هونەر، رەنگدانەوەی واقعن. بەڵام واقعێکی بێکەنارو بێسنوورو بێلێوار، واقعێکی نائاسایی، نەك ئاسایی، واقعێکی خرۆشاو نەك واقعێکی چەسپاو، واقعێکی بزێو نەك ئەو واقعەی ملکەچی سیستەمە کۆنە چەقبەستووەکانە، کە گیان و جەستەو هیواکانی مرۆڤانی مرۆڤ تیایاندا وشك و بۆگەن و خەسێنراو ئەکرێ.

ئەگەر لەم کلاورۆژنانەوە سەیری کورتە چیرۆکەکانی عەتا نەهایی بکەین، ئەوا ئەبینین ناوبراو ئەیەوێ لە پێناسەی داهێنانی رەسەن و راستەقینەی چیرۆکنووسی نزیك بێتەوە.

عەتا تا ئێستا دوو چەپکە کورتە چیرۆکی بە جیاجیا لە زریکەو تەنگانەدا، چاپ و بلاو کردۆتەوە. لە کۆمەڵە چیرۆکی زریکەدا ساڵی ١٣٧٢ی هەتاوی - ١٩٩٣ ز- لە تەورێز ئینتیشاراتی ناجی - بانە، بلاوی کردۆتەوە، ٩ کورتە چیرۆکی بەم ناوانە تێدایە: مەچەکێك لە تەڵەی پێنج پەنجەدا، تەزووی ئازارێکی کۆن، مەرگی نووسەر، زریکەیەك لە قورگی شەودا، نابێ شێرە پێ بزانێ، ئەو لەو مەراقێکی دێرین، دوو وێنەی ون، رۆژێ لەورۆژانە، چاوەروانیی.

لەکۆمەڵە چیرۆکی تەنگانەشدا، کە زستانی ١٣٧٤ی هەتاوی - ١٩٩٦ز لە تەورێز - لەسەر ئەرکی خۆی چاپی کردووە، ئەم کورتە چیرۆکانەی لەخۆگرتووە: شەو قەلای مێردە، من..تۆم..خۆش..دەوێ، بەهیوای باران، مەسخ، لەگەڵ کۆچی پەرەسێلکەدا، ورمزو پەیکەرێك لە قورقوشم، هۆرەی وەرزی بەردبارین، چیرۆکێکی ناتەواو، رابوردوویەك لە ئاگردا.

جگە لەم کورتە چیرۆکانە، رۆمانێکیشی بەناوی گوڵی شۆران، ئامادەی چاپە (وەك لەدوا لاپەری - تەنگانەدا نووسراوە).

بەلام بەر لەوەی لە چیرۆکەکانی عەتا نزیك ببینەوە، بەچاکی ئەزانم سەرنجێك

دەربڕم و بڵێم: ئەگەر تاقیکردنەوەی شیعری کوردی، تاقیکردنەوەیەکی سەرتاسەریو یەکپارچەیی بێت؛ مانای وایە پردەکانی نێوان شاعیرانی دوێنێو ئەمڕۆی کورد، زۆرترو بەهێزترە. واتە: شاعیرانی کورد زەبرو جێپەنجەو ڕەنگدانەوەی تاقیکردنەوەکانیان لەسەر یەکتری هەیە. کەچی ئەم دیاردییە لە جوگرافیای چیرۆکی کوردیدا، بە جۆرێکی ترە. چونکە(بۆ وێنە): ئەگەر تاقیکردنەوەی چیرۆکی کوردی - کوردستانی عێراق، لە ساڵانی پێرەوەکەبووینەوە ١٩٢٥ز، واتە لەدوای چیرۆکی لەخەومای جەمیل سائب -ەوە، تا ئێستا لە یەکتر نەپسابێو هەر بەرەو پێش چووبێ؛ بەڵام ئەم تاقیکردنەوەیە تا درەنگانێکیش نەیتوانیوە پردی پەیوەندیو تاقیکردنەوەکانی خۆی بگەیەنێتە کوردستانی ئێران. کە ئەم دیاردییە ئەوەندەی وتنی سەختە، ئەوەندەش وتنی پێویستە. لەبەر ئەوە تاقیکردنەوەی ئێستای چیرۆکی کوردی - کوردستانی ئیران، تاقیکردنەوەیەکە، تارادەیەك کەش و هەواو تایبەتیتری هەیە. چونکە ئەگەر پێشمەرگەی ڕەحیمی قازیو پێکەنینی گەدای حەسەنی قزڵجی، لەهەندێ لایەنەوەو بەتایبەتیش پێکەنینی گەدا - کە بڕێکیان لەناو چوارچێوەی تاقیکردنەوەی چیرۆکی کوردستانی عێراقدا جێگەیان ببێتەوە - ئەوا تاقیکردنەوەی فەتاحی ئەمیری - هەوراە بەرەو میرزا - بۆکان و محەمەدی ڕەمەزانی - کورتە چیرۆکە بڵاوکراوەکانی لە گۆڤاری سروە-دا بۆکان و ناسری وەحیدی - خەوەراو - بۆکان و عەتا نەهایی -بانە، جگە لەوەی هەریەکەیان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، لەهەمان کاتیشدا ئەگەر بە گەلێ سەرەداویش بە تاقیکردنەوەی سەرتاسەری چیرۆکی کوردییەوە ببەسترێنەوە بەڵام لە زۆر لایەنەوە لە تاقیکردنەوەی سەروەری چیرۆکی کوردی، جیاوازترن. لەپاڵ ئەمانەشدا، تەمەنیشیان، لەتەمەنی چیرۆکی کوردی کوردستانی عێراق، ساواترە.

هەرچەندە جگە لەو ناوانە، ناوی تریش هەن تەقەللای نووسینی چیرۆك و بڵاوکردنەوەی ئەدەن، وەك: جەلال مەلەکشا - سنە، خانم کافیە جەوانرودی - مەریوان، ئەنوەری ڕەوشەنی - مەریوان، خانم ئامینەی عەزیزی - سەقز، توفیقی موشیرپناهی - سنە، خانم ژیلا حسینی - سنە، مارف ئاغایی - شنۆ، عومەری مەولوودی - بۆکان.

بەڵام عەتا نەهایی سەرەرای ئەوەی لە کارەکانیا لە هاوڕێکانی جیاوازترە، لەهەمان کاتیشدا لە تەمەنی تاقیکردنەوەکەیدا، کە هەر ٥ - ٦ ساڵ ئەبێ، بە

هەنگاوی زۆر گورج و خێرا، بەرەو پێشەوە ئەچێ بە تایبەتیش لە کۆمەڵە چیرۆکی تەنگانەدا، کە لێرەدا ئەمانەوێ بە خێرایی قسەی لەسەر بکەین.

هەر لەیەکەمین خوێندنەوەی بە پەلەی چیرۆکەکانی تەنگانەدا، یەکسەر ئەوە بە دەستەوە ئەدات کە تان و پۆی چیرۆکەکان و پاڵەوانەکانیو جۆری چنینی رستەکانیو کەش و هەوای تێکڕای چیرۆکەکان؛ بەهەموو مانای وشەی تەنگانە، لە تەنگانەدان. پاڵەوانەکان لەباری دەروونەوە، شپرزەو پەژارەو شڵەژاون. هەڵس وکەوتیان نائاساییو بێئارام و تا ئاستێکیش تووڕەو هەڵچوون. هەندێ جاریش بەسەرو سیماو رواڵەت، جۆرێکن و لەئاکارو رەوشتیشیاندا جۆرێکی ترن. کە ئەم لەت و پەرتبوونەیان نموونەیەکی زۆر ئاشکراو زیندووی مرۆڤی ئەم سەردەمەیە؛ بەتایبەتی مرۆڤی ئەم سەردەمی جیهانی سێیەم، کە تیایدا مرۆڤ گیرۆدەی دەیان و دەیان کێشمە کێشم و دەردەسەریو تێشکان و هەڵسانەوەو زۆرانێکی ئێجگار نابەرامبەرە. عەتاش ئەم تەنگانەیەی بە جۆرێك بۆ خولقاندووین، تا هەست بکەین ئەو هۆیانەش کە لە دروستکردنی ئەم تەنگانەیەدا، بەشدارن؛ ئەوانیش سەر لە رێگاکانی چارەسەریو دەربازکردنی تەنگانەی ئەو کۆمەڵگایە دەرنەکەن.

ئەگەر ئەم شەقڵە، مۆرکی تێکرای چیرۆکەکان بێت، ئەوا یەکە یەکەی چیرۆکەکان، وردتر ئەم ناسنامەیە ئەدەن بە دەستەوە. هەرچەندە کاری ئەم بەسەرکردنەوەیەی من، یەکلاکردنەوەی وردی هەموو چیرۆکەکان و راڤەکردنیان نییە. تەنانەت نامەوێ پردێکیش بم لەنێوان خوێنەران و نهێنیە جوان و شیرینەکانی ناو ئەم چیرۆکانەدا. چونکە ئەگەر ئەم کارە بکەم، مانای وایە لە لایەکەوە لەنرخی چیرۆکەکان کەم ئەکەمەوە؛ بەوەی بەتەنیا کلیلێك رازەکانی ئەم چیرۆکانە بخەمە سەرپشت. لەلایەکی تریشەوە رێگاش لە خوێنەران ئەگرم، تا خۆیان دوای سەرنج و پیاچوونەوەی هوشیارانەیان، هەوڵ بدەن بەهۆی چەندان کلیلی جۆراوجۆرەوە لەدووتوێی چەندان لێکدانەوەدا، تێهزرێن و بەگوێرەی بزاف و جموجۆڵی یەك لەدوای یەکی کۆپلەو رستەکاندا، وێنەو مەبەستە جوانەکانی ئەم چیرۆکنووسە، بەیەکەوە بلکێنن، کە توانیویتی خەمی ئاڵۆزسکاوی مرۆڤی ئەم سەردەمی تێکچرژاوەمان لەدەیان و دەیان وێنەی شیواودا نیشان بدات. بەجۆرێك ئەگەر شوێن میعمارسازییو رستەبەندییو دارشتنی سەرتاپای چیرۆکەکان بکەوین، ئەزانین کە لە زۆربەی دارشتنەکانیا، هەر بەدەستی ئەنقەست و بەمەبەستی

نیشاندانی پەرتبوونی باری دەروونیی پاڵەوانەکانی، زۆر زیرەکانە کامێرای وێنەکان بەبێ هۆ وەك نیشاندانی ئەوەی کەش و هەوای رووداوەکان، لەناو کارەسات و لێقەوماواندا بن، ئاوا وێنەکان بە پەلە لە رووداوێکەوە بۆ رووداوێکی تر ئەگوێزێتەوە. کە ئەگەر بە ئەندازەی بزووتنی خێرا خێرای رووداوەکان، نەچینە پێشەوە، ئێمەش لەناو رووداوەکاندا ئەپەشۆکێین و سەرمان لێئەشێوێ. کە عەتا ئەم کارەی زۆر مەبەستەو زۆر بە ئاگایی ئەیەوێت لەباری تەنگانەی پاڵەوانەکانی بە ئاگامان بێنێتەوە. واتە: ئێمەی خوێنەر؛ ئەخاتە بەر لێپرسینەوە، لەو تەنگانەیەی کە مرۆڤی ئەم سەردەمە تیایدا ئەژی. لەم رووەوە هەر بۆ ئەوەی ئەمجۆرە نموونانە بەرچاو بخەین، ئەم پەرەگرافە لەهۆرەی وەرزی بەردبارین دا، وەکو خۆی بۆ ئێرە ئەگوێزینەوە: (ئەو شەوە تا دەمەی بەیانی - هەنلۆخان - لەسەربانی ماڵی کابرای گردیلانە، بە سۆزەوە هۆرەی کرد. بۆ بەیانی، تا ئێوارە گەران، ئەوسا تەرمەکەیان هێنایە دەر. کە هەڵۆخان -یان گرت، وەرزی بەردبارین دوایی پێ هات).

لەبەرئەوە عەتا لەم چیرۆکانەیدا، ئەوەی مەبەستێتی بەم شێوە دارشتنە داپڕاوە، حاڵەتێك -ی داپڕاومان تێبگەیەنێ، ئەوەندە مەبەستی نییە بچێتە ناو وەسفێکی وردی لەیەك نەپچراوی پڕ لە رستە رازاندنەوەوە، کە لێزانیی خۆیان لە پەخشان نووسین و واژە کۆکردنەوەو شارەزایی لە رێزماندا، بۆ بسەلمێنێ. چونکە ئەگەر هەندێ نووسەر بە پەخشانی رۆمانتیکانەو وەسفی بێسەروبەر پانتایی چاومان داگیر بکەن، ئەوا ئەمجۆرە چیرۆکانەی عەتا ئاسا، قووڵایی هزرمان داگیر ئەکەن. کە بێگومان کاری نووسەریش هەر ئەمەیە. لەبەرئەوەی ئەو جۆرە پەخشانانە، ئەو وەسفە بێسەرو بەرانە، وەك ئەو وێنە فۆتۆگرافیانەن کە هەندێ گۆڤارو رۆژنامەی دواکەوتووە، بە مەبەستی بزواندنی گیانی بەزەییو سۆز نوازیمان؛ وێنەی جووتیارێکی کورد، بە جووتێ گاو گاسنەوە، یان هەمان جووتیار، لەکاتی دروێنە کردندا کە داس -ی بەدەستەوەیە، لەسەر لاپەڕەکانیان بڵاویان ئەکەنەوە!. لەکاتێکا پەیامی ئەدەب و هونەر لەوەدایە، لە جیاتی ئەوەی پانتایی چاومان بە وەسفی ئەو وێنانەوە خەریك بکەین، لەسەریان پێویستە لە رێگەی تری هونەری تەکنیك و دارشتن و دەربرینی تازەوە، هزرمان بخەنەگەڕ، تا بزانین بۆچی تا ئێستاش جووتیارەکانمان لەم بارە دواکەوتووەدا ئەژین! جگە لەوەی کە ئەرکی نووسەر لە

گەیاندنی پەیامەکەیدا، ئەوەندەی ئەبێ هەوڵ بدات لەهاوئاهەنگیو پێکەوەتەبایی کردنی نێوان کۆڵەگەکانی چیرۆکنووسیدا هونەر بنوێنێ؛ ئەوەندە مەرج نییە یەکێك لە کۆڵەگەکانی هونەری چیرۆکنووسیدا زاڵ بکات. چونکە ئەگەر چەند مەرجێك بۆ نووسینی کورتە چیرۆ هەبن، ئەوا تەنیا یەکێکیان لایەنی زمان -ە. کە لێرەدا ئەبێ ئەوەش بڵێم وەك چۆن نووسەرێك لە دەقێکدا، کۆمەڵێك کەرەسە ئەکات بە هەویرو بەگوێرەی مەبەستی خۆی، لەناو دەستیا شتی لیٚدروست ئەکات؛ هەر بەو جۆرەش ئەو زمان -ەی کە خاوەنی دێرینەو رێزمان و کۆمەڵێك سەروەرییە، لەکاتی بەکارهێنانیا لە دەقێکدا، هەموو ئەوانە لە دەست ئەدات. واتە: ئەگەر واژەیەك لەکاتی ئاساییدا، لەسەدان ساڵەوە تا ئێستا، بەگوێرەی فەرهەنگ (قاموس) مانایەکی تایبەتی هەبێ، بەڵام هەر ئەو واژەیە، لەکاتی بەکارهێنانیا، لەناو رستەیەکی هونەریدا، ئەو مانا قامووسییەی خۆی لە دەست ئەدات و ئیتر چەندین ماناو مەودای تری بەبەردا ئەکرێت. بە مانایەکیتر: کە واژەیەك لە دەقێکی هونەریدا بەکار ئەبرێ، واتە: ئەهونەرێنرێ. بەکورتی وەك ئەو بەردەی لیٚ دێت، کە پەیکەرتاشێك ئەیخاتە بەردەستیو شتی تری لیٚدروست ئەکات. بەمەش لەهەموو روویەکەوە، لەو بەردەی جارانی خۆی جیاوازتر ئەبێ کە هێشتا پەیکەرتاشەکە بەکاری نەبردبوو. نموونەی ئەم بەردە، هەموو ئەو داروتەختەو ئاسنەیە، کە دەرگاو پەنجەرەو شتی تریان لیٚدروست ئەکریٚو ئیتر لەباتی ئەوەی دارو تەختەو ئاسن بن، ناویان ئەبێتە: پەنجەرەو دەرگاو..لەبەرئەوە هەر وشەیەك -یش ئەبرێتە ناو دەقێکەوە، ئیتر لەوەودوا، ئەو وشەیە، ئەو مانا، یان چەند مانایەی ئەبێت کە نووسەرەکە مەبەستێتی. بۆیە ئەگەر رەنگی سەوز لە قاموسدا هەر مانای سەوز بگەیەنێ، یان هەتاو هەر مانای خۆر بگەیەنێ؛ بەڵام لەدەق -ی ئەدەبیی‌دا، مانای تریان هەیەو دەوڵەمەندتر ئەکرێن. ئەمەش بەئاگاهاتن و بەتەنگەوەهاتنی نووسەرانە، بۆ رزگارکردنی زمان لەو کۆت و زنجیرە قامووسییانەی سەدان ساڵە کراونەتە دەست و پیٚوگەردنی زمان -ی سڕکراو، لە تەنیا مانایەکدا. لەبەرئەوە کاتیٚ نووسەرێك گەرکێتی ماناو مەودای تر بە واژەیەك بدات، ئەو ئاڵوگۆڕەی بەسەردا دێنێ، کە مەرجەکانی کۆدەتاکەی لیٚی داوا ئەکەن. مەرجەکانیش بریتین لەوەی زمان رام بکات، تا دەست لە مێژووی رابوردوی خۆی هەڵگریٚو ومێژوویەکی تازە، بۆ ماناو مەودا تازەکانی بنووسێتەوە. کە بەمەش نووسەرەکە،

بۆچوون و جیهانبینی خۆمان بۆ دەرئەخات. جگە لەوەی هەر لێرەشدا پێویستە ئەوەش بلێم: مەگەر هەر نووسەری خولقێنەر بزانن، کە ئەم کاری گیانی تازەکردنەوەیە، بەبەر زمان دا، کارێکی چەند سەخت و دژوارەو چەند بە کوێرەوەری وا لە زمان ئەکرێت، ببێتە زمانێکی ترو زمانێکی تر فێر ببێ‌و، چەندیش بەگران، ئەو مێژووە درێژەی خۆی، لەساتە خێراو بروسکە ئاساییەکانی داهێنان و خولقاندن دا، لەبەر دائەمالرێ‌و لەهەمان کاتیشدا، لەمەش سەخت تر، چەند بەگران ئەتوانێت لە خوێنەری دەقێکی تازە بگەیەنێت، کە ئەویش ئەبێ خۆی فێری ئەم زمانە تازەیە بکات!

لەم رووەوە زۆربەی کەرەسەکانی زمان -ی چیرۆکەکانی عەتا، هەرگیز ئەو مانایانەیان نییە کە پێشتر لەگەڵیاندا راهاتووین و لەژیانی واقعی ماندا بەکاریان دێنین. بۆیە ئەگەر واژەی باران و هەڵۆو دایك، لەچیرۆکەکانی: بەهیوای باران، هۆرەی وەرزی بەردبارین و مەسخ دا هەر بە گوێرەی مانا قامووسییەکانیان لێکیان بدەینەوە، ئەوا هەر لە بنەڕەتەوە سەرەداوی تێگەیشتنی چیرۆکەکانمان لی‌ ون ئەبێ. چونکە ئەو واژانەو گەلێکی تریش لەو جۆرانە، هیچیان بەگوێرەی ئەو مانایانە نین کە لە واقع دا بەکاریان دێنین. بەڵکو لەدەرەوەی قامووسن. واتە: لەدەرەوەی واقعن. بۆیە پێم سەیرە برای رەخنەگر، کاکە مەنسووری حامیدی، لە یەکێك لە ژمارەکانی گۆڤاری ئاوێنەدا، بە جۆرێك لە چیرۆکی هۆرەی وەرزی بەردبارین-ی روانیبوو، وەك ئەوەی رووداوێکی واقعی، یان چیرۆکێکی سرووشتیی هەلسەنگێنێ!. لە کاتێکدا ئەبوایە هەر بە ناونیشانی چیرۆکەکەدا: هۆرەی وەرزی بەردبارین، یەکسەر بیری بۆ ئەوە بچووایە کە لە واقیعدا، وەرزێك نییە بە ناوی وەرزی بەردبارین. بەڵکو لە سەدان ساڵ لە مەوبەرەوە، دەستەواژەی بەردبارین لەناو ئێمەدا وەك ئەفسانەیەك بەکاردێت. ئیتر هەر لەم کلاوڕۆژنەیەوە واژەی هۆرەش، ئەو هۆرەیە نییە، کەمانای گۆرانی‌و ستران بدات. بۆیە ئەگەر بەم پێودانەو هەر لەم چیرۆکەدا، لەخات پیرۆزو نازداریش وەردبینەوە، هەست ئەکەین هیچیان ئافرەتی ئاسایی نین، بەڵکو رەمزن بۆ مانای‌تر.

ئەکرا ئەو دیدەی کاکە مەنسووری حامیدی ئەم چیرۆکەی عەتای پێ نرخاندبوو، لەگەڵ (بۆ وێنە): چیرۆکەکانی پێکەنینی گەدادا، پیادە بکرێ، کە نموونەیەکی زەقی وێنەکێشانەوەیەکی بێ روتوش و راستگۆی کۆمەڵگای کوردەوارییە. بەڵام

ئاخۆ ئەکرێ هەمان دیدی روانین لە تاقیکردنەوەی ۳۰ساڵ لەمەوبەرەوەی پێکەنینی گەداوە، بۆ ۳۰ ساڵ لەوەدوای عەتا نەهایی بگۆزینەوەو بە هەمان یەك دید، دوو تاقیکردنەوەی دوو رۆژگار بنرخێنین!؟

هەرچەندە عەتا لەبەکارهێنانی ئەو مەودا جیاوازانەدا، بۆ ئەو واژانە، شتێکی تازەو سەمەرەیشی نەکردووە، تا پێمان وابێ مەتەڵ ـی لێ داهێناوین. چونکە هەندێ رەمز هەن، لە سەدان و هەزاران ساڵەوە، تا ئێستاش بەجۆرێك کەوتوونەتەوە، وەك ئەوەی پێیان ئاشنا بووین. بۆ وێنە: لە هەر دەقێکدا واژەی کۆتر ببینین؛ ئیتر دەم و دەست بیرمان بۆ مانای ئاشتی ئەچێت. یان کە واژەی گورگ ئەبینین، یەکسەر درندایەتیو کەم فرسەتییو هێرش و پەلاماری غافلگیرانەمان بە بیردا دێت. ئیتر هەر بەمجۆرە گەلێ ناویتر، کە لە چیرۆکەکانی تەنگانەوان، ئەبێ کەمێك بیریان لێبکەینەوە، ئەوسا خۆیانمان لا ئاشکرا ئەکەن. ئەوسا ئەیانناسینەوە. کە ئەبێ هەمان ئەم کارە، لەگەڵ دارشتنە بە ئەنقەست دارێژراوەکەی چیرۆکەکانیشدا بکەین، ئەوسا وێنە لە یەکتر ترازاوەکان، وێنە لانەوازەکان، لە خەیاڵماندا ریز بکەینەوە، بە گوێرەی ئەو میعمارسازییەی هزرمان داخوازی ئەکات، بیر لە ریزکردنەوەو دارشتنەوەیان بکەینەوە؛ ئەوسا ئەم کۆلاژو مۆنتاژ کردنەوەیە، پێمان ئەڵێت: عەتا نەهایی بەهۆی ئەم کارەیەوە ئەیەوێت ئەو شتەمان پێ بڵێت، کە راستەوخۆ خۆی پێمان ناڵێت، بەڵکو بیرکردنەوەی ئێمە، لەدارشتنەوەی سەر لەنوێ دەقەکە، مەبەستەکەی عەتامان پێئەڵێت، نەك گفتوگۆو مەنەلۆژی راستەوخۆی عەتا لەدووتوێی چیرۆکەکاندا. کەواتە هەموو دەقێکی سەرکەوتوو، ئەو شتەمان پێ ئەڵێت، کەخودی دەقەکە پێمان ناڵێت. کە خۆی بومان نادرکێنێ، بەڵکو جۆری تێگەیشتنی ئێمە، لە دەقەکە، ئەیدرکێنێ.

بەمجۆرە عەتا سەرلەنوێ، ئەوەمان لا ئەسەلمێنێ کە ئەو خەمەی لە دڵ و لە ئەستۆی پاڵەوانەکانیدایە، وای لێکردوون ناتوانن وەك مرۆڤی ئاسایی بدوێن و زنجیرەی بیرکردنەوەو دەربرینیان، وەك مرۆڤی ئاسایی ، ئاسایی بێت و رستەکانیشیان رێك و پێك و بێساتمەکردن، دەربڕین و مەبەستەکانی دڵیانمان بە روونیی تێبگەیەنن. بەڵکو ئەوەندە لە تەنگانەدا، هەست ئەکەین لە ئاخاوتنیشیاندا لە تەنگانەدان و ئەبزرکێنن.

هەرچەندە شێوەی دارشتن و رستەبەندیی چیرۆکەکانی عەتا، ئێجگار تۆکمەو

پتەون و پەیوەندی رستەکان، پڕیانە لە ئاشنایەتی یەکترو زۆر تەباو گونجاون. بـەڵام ڕووداوەکانمان ئەوەندە خێرا، خێرا نیشان ئەدات، وەك ئەوەی زەمان -مان لە چـەند لاپەرەیەکی زۆر کەمدا، بۆ کەم و کورت بکاتەوە.

لەدەرفـەتی باسـکردنی زمـانی چیرۆکـەکانی تەنگانـەدا، بـەچاکی ئـەزانم دوو سەرنجی هاورێی شاعیرم کاکە مارف ئاغایی بە یـاد بهێنمـەوە؛ کـە لـە باسـێکی دووقۆڵیماندا بەرامبەر بەزمانی عەتا دەری‌بڕیو سەرنجەکانیش چونکە ژیرانە بوون، پێم چاك بوو باسیان بکەم:

١ ـ زمانی چیرۆکەکانی تەنگانە، لەچاو زمانی کۆمەڵە چـیرۆکی زریکـەدا زۆر جیاوازن، لەبەرئەوەی لە تەنگانەدا تەقـەڵلای خەسـت کردنەوەیـەکی چڕو تۆکمـە لەدەربڕینی مەبەست و نیازدا دراوە. رستەکان کورتن و خێراتریش مانا بەدەسـتەوە ئەدەن، کە ئەمە نیشانەی بەرەو پێشەوەچوون و بەتەنگەوە هاتنی عـەتایە بۆ زمان.

٢ ـ بەڵام هێشـتا شـێوەی دەربڕیـن و بیرکردنـەوەی عـەتا لـەزمان، لەئاسـتی خۆزگەکانی ئێمەدا نین؛ چونکە هەست ئەکەین ئەوەندەی پشت بە دەقی زمانی نـاو دووتوێی کتێب ئەبەستێ؛ ئەوەندە زمـــانی ئاخـاوتنی ئاسـایی خـەڵك نـین. واتـە: کەرەسەکانی زمانی عەتا راستەوخۆ لـــە خـەرمانی نـاو جـەماوەرەوە نـاهێنرێن و مامەڵەیان لەگەڵ بکرێ، بەڵکو هەست ئەکەین ئەو زمانەی عـەتا بـەکاری دێنـێ، بەر لە عەتاش ئاڵوگۆریان بەسەردا هاتووە؛ کە ئەو ئاڵوگۆرە هەندێ سنوورو پێوانە بۆ عەتا دیاری ئەکەن و سـڵی ئـەوەی ئەخەنـە بـەر، تـا بـە ڕەهـاییو بـەگوێرەی هەڵشێلانەوەیەکی تازە، ئاڵوگۆری تازەتریشیان بەسەردا نەیەت.

لەنێوان رایەڵە قایم و بەرچاوەکانی چیرۆکەکانی: بەهیوای باران، مەسخ، هۆرەی وەرزی بەردبارین، چیرۆکێکی ناتەواو -دا، ئەو رایەڵەمان ئاشکراتر دێتـە بـەرچاو، کـە پاڵەوانـەکانی ئـەم چیرۆکانـە، بـەجۆرێك بەکۆمـەڵگاو پەیوەندیگـەلی کۆمەڵایەتیەوە بەستراونەتەوە، هەست ئەکرێ پاڵەوانەکان ئەرکی ئێجگـار گـەورەو ترسناکیان لـە ئەسـتۆدایە؛ هـەر لـەو پاڵەوانانـەوە کـە نوێنـەری نەرێتـە کـۆن و دواکەوتووەکانی ناو کۆمەڵگان، تا ئەو پاڵەوانانەی لەو پەیوەندییانە یاخی ئـەبن و ئەبنە نوێنـەری خـەون و سیسـتەمێکی تـازەو راپـەریو، واتـە: هـەردوو نموونـەی پاڵەوانەکان، لەناوجەرگەی واقع-ی کۆمەڵگادان و هیچیان لـەدەرەوەی واقـع و لـە پەراوێزی ڕووداوەکاندا ناژین. لەنێوان ئەم دووانەشدا، گرکانێکی شـاراوەو نادیـار،

هەست پێئەکەین. کە عەتا هەموو خەونەکانی ئەم کۆمەڵگایەی لە هۆرەی وەرزی بەردبارین دا، خەست کردۆتەوەو ئەم رێبازە تازەیەی بۆ راتەکاندن و گۆرینی کۆمەڵگا، بەو هۆرەیەوە پێشنیار کردووە. بۆیە لەو چەند چیرۆکەدا، سێبەری ئەم پاڵەوانە نادیارە ئەبینرێو بە هەموو رێگەیەك و بەدەنگی بەرز هاوارمان لێئەکات پشتیوانی لێبکەین.

رایەڵی چیرۆکەکانی من..تۆم..خۆش..دەوێو رمزو پەیکەرێك لە قورقوشم - یش، جیهانی جیاوازی دوو مرۆڤن، کە رۆژانە چەندان نموونەیان لە نزیکمانەوە ئەبینین. ئەم دوو جیهانەی ناو ئەم دوو چیرۆکە، سەرەرای ئەوەش زۆر لە یەکتر دوورن، بەڵام لەهەردوو چیرۆکەکەدا، دیوی شاراوەو ناوەوەی دەروونی دوو مرۆڤمان بۆ بەرجەستە ئەبن، کە شکۆی کەسایەتیو مرۆڤانی خودی ئەم دوو مرۆڤە، خۆیان هیچمان بۆ نادرکێنن، بەڵکو بەهۆی جوولانەوەو ئاکاری ئاسایی ئەم دوو مرۆڤەوە، ئەم بارە دەروونییو شاراوانەمان بۆ روون ئەبێتەوە. لەکاتێکا نهێنییەکانیش ئەوەندەی پەیوەندییە دواکەوتووەکانی کۆمەڵگا، رێگای بۆ وتن و درکاندن لێگرتوون، ئەوەندەش مرۆڤانەن؛ بەتایبەتی چیرۆکی من.. تۆم..خۆش..دەوێ..، کە قورسایی خەمەکەی، بەهۆی وتن و درکاندنیەوە لە چیرۆکەکەدا، کەمێك سووك ئەبیو ئۆخژنێك بە هەستی پاڵەوانەکەو ئێمەی خوێنەریش ئەبەخشێ.

چیرۆکەکانی شەو قەڵای مێردەو لەگەڵ پەرەسێلکەداو رابوردوویەك لە ئاگردا - ش، هەریەکەیان بابەت و شێوازێکی جیا جیان. بەتایبەتی شەو قەڵای مێردە کە لە هەردوکیان جیاوازترو تایبەت ترەو چیرۆکنووس ئەوپەری وردەکارییو هونەرییانەی خۆی لەپێکهێنانی بابەتێکی ئێجگار ئاسایی بەکارهێناوە، کەلەهەمان کاتدا ئەیتوانی بە ئەندازەی سادەیی ناوەرۆکەکەی، چنینەکەیشی سادە بکاتەوە. بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین بەراورد لەنێوان ئەم دەقەو ئەو دەقانەدا بکەین کە هەر ئەمجۆرە بابەتە ئاساییانە، بە وەسفی ساردوسرو دارشتنی درێژ، پڕ ئەکەنەوە، کە ئەگەر ئەنجامگیریی بەراوردەکەمان بۆ دەرکەوت، ئەوا ئەزانین کە جیاوازیی نێوان ئەم دوو شێوازە، جیاوازیی نێوان شێوازی دەربرینی هونەرییو شێوازی رۆژنامە ئاساییە. کە دیارە جیاوازی نێوان پەیامی ئەدەب و هونەر، لەگەڵ پەیامی رۆژنامەوانیدا، ئاسمان و رێسمانە. چونکە ئەگەر سەدان جیاوازیی لەنێوانیاندا بێت. ئەوا یەکێك لەو سەدان جیاوازییە، ئەرکی وشەیە. چونکە وشە لە ئەدەب دا،

ماناى هەستکردنە بە زەمان و لە هەمان کاتیشدا دەربازبوونە لە زەمان. کەچی لە (رۆژنامەوانی)دا، وشە ئەرکی نووسینەوەی زەمان -ە، بەواتەیەکی: وشە لە رۆژنامەوانیدا ماناکەی لە روخساریدایە. بەلام لە ئەدەب دا، ماناکەی لە روخساری دائەمالرێو مانای‌تر، بەدیوی ناوەوەیدا، بەناوەرۆکیا، ئەکرێ. کە بەمەش زیندەخەون بۆ قوولایی هرزو چاومان دروست ئەکات، نەك هێشتنەوەی هرزو چاومان لە زەمان -ی هەست و ئاگاییدا.

ئەگەر ئەم چەند سەرنجە خێراییەم، تایبەت بن بە سیماکانی دیوی دەرەوەی کۆمەڵە چیرۆکی تەنگانە، ئەوا یەکە یەکەی چیرۆکەکان سەربەخۆییو تایبەتمەندێتی خۆیان هەیەو هەریەکەیان لەدوو توێی خۆیاندا، بەتەنیا بۆ خۆی رووداوێکە، کە پشکنین و دۆزینەوەی نهێنی ناو ئەو رووداوانە، بۆ خوێنەر خۆی ئەهێڵمەوە.

بەلام منیش وەکو خوێنەرێك مافی ئەوەم هەیە بڵێم: دوای خوێندنەوەی تەنگانە، چیرۆکەکانی: بەهیوای باران، مەسخ، هۆرەی وەرزی بەردبارین، بەگشتیو بەتایبەتیش مەسخ ئێجگار سەراسیمەیان کردم.

دیسان لە سەرنجێکی گشتیدا پیش خوێنەر ئەکەوم و ئەڵێم: ئەگەر چیرۆکەکانیش هەریەکەیان بۆ خۆی جیهانێکی سەربەخۆ بێت، بەلام بە هەمووشیان ناسنامەی عەتایان پێوە ئەبینرێو عەتاش لەگەڵ سەربەخۆیی هەر یەکێکیاندا، توانیوێتی بەدەم کۆچکردنیەو، لەجیهانی چیرۆکێکیەوە بۆ چیرۆکێکی‌تر، کەش و هەواو تایبەتمەندێتی کۆچی پێشووی (چیرۆکی پێشووی) لەخۆی دائەماڵێو بە سنعەت و بەهرەیەکی تازەوە بچێتە کۆچێکی تازەترەوە (چیرۆکێکی تازەترەوە). کەئەم دەسەلاتە دڵخۆشکەرەیە، جگە لەوەی قەوارەی سەربەخۆی چیرۆکەکان ئەپارێزێ، لەهەمان کاتیشدا هەڵبژاردنی ناوەرۆك (بابەت)ی چیرۆکەکان، چاوقایمیو رچەشکاندنێکی تازەیان تێدا ئەبینرێ.

عەتاش، لەم کۆچە بەردەوام و تازانەیدا، بێ‌پشوو، رێگەیەکی دوورو سامناکی تاقیکرنەوەیەکی سەخت ئەبڕێو ئێمەش لەگەڵ خۆیدا، بەرەو ئەو ئاسۆ نادیارو تایبەتی خۆی ئەبات، کەبە تەقەڵلای درەوشاوەی عەتا، رووبەری جوگرافیای چیرۆکی کوردی، درەوشاوەترو بەرینتر ئەکات.

سەقز

پاییزی ١٩٩٦

# مارف ئاغایی
# شاعیری تەنیایی‌و ماڵئاوایی
## محەمەد حەمە باقی

مەرگی کتوپرو بەرودوای سێ شاعیری هەڵکەوتووی وەك :سوارە ئیلخانی‌زادە (١٩٤٢ - ١٩٧٥)، خانم ژیلا حسەینی (١٩٦٤ -١٩٩٦/٩/٢٤) و مارف ئاغایی (١٩٦٥ - ١٩٩٨/٢/١٩)، لەهەڕەتی لاوی درەوشانەوەی شاعیرانەیانداو لەماوەی (٢٣) ساڵی رابردوووداو لەهەمان کاتیشدا بەکارەساتی دڵتەزێنی ئوتومبیل و هەرسێکیشیان لەتەمەنی (٣٣) ساڵی‌دا؛ ئەوەندە جێی سەرسوورمانە، ئەوەندەش کۆست و هەرەسێکی ئەدەبیی‌و فەرهەنگیی چاوەروان نەکراوە، بۆ شیعری ئەم بەشەی نیشتمان؛ کە پرکردنەوەی جێگەی هەر یەکێکیان لەکاروانی شیعری هاوچەرخی کوردستانی ئێراندا، کارێکی ئەستەم و درێژخایەنی دەوێ..لەلایەکی تریشەوە پێناسەکردنی شیعرو شاعیرێتی هەر یەکیکیشیان، دەرفەت و مەودایەکی تری دەوێ؛ کە ئەم وتارە کورتە، تەقەللایەکی دەستپێشکارانەیە بۆ بەسەرکردنەوەی شیعری یەکێك لە دوایین جوانەمەرگی ئەم سێ‌کوچکە شعرییە، واتە: شیعری مارف ئاغایی..بەلاّم لەکلاّورۆژنەو بە پێودانی نەخشەی شیعری کوردی - کوردستانی ئێران.

* * *

شیعر ئاسکێکی کێوی سلۆك و سرکەو بەئاسانی دەستەمۆ ناکرێ. بۆیە بەپێی بیرورای زۆربەی رەخنەگرانی جیهان، باسکردنی شیعر، بەکارێکی دژوارو ناسك لەقەڵەم دەدرێ‌و هەر لەبەرئەمەش بە تۆبزی‌و زۆرەملێ، سەری پێ‌نەوی ناکرێ‌و ناچێتە ژێر رکێفی هیچ تیۆرو پێناسەو قالّبێکی مەندو وەستاوەوە.

خۆ ئەگەر بەم سڵ و پارێزەوە، لە پێناسەی شیعری مارف ئاغایی بگەڕێین، ئەوا ئەم شاعیرە ئەو پێناسەیە هەڵدەگرێ؛ کەهەر تایبەتمەندێتی شیعرەکانی دەیخوازێ.

ئەم شاعیرە، لە جوگرافیایەکی شیعریدا چاوی ئەدەبیی کردەوە؛ کە پۆلێك شاعیری وەك: سوارە ئیلخانی‌زادە، فاتیحی شێخولئیسلامی (چاوە)، عەلی حەسەنیانی (هاوار)و قاسم موئەیەد زادە (هەلۆ)، زەمینەی یاخیبوونیان لە مەرجەکانی شیعری عەرووز دەست پێکردبوو..بەلاّم دەستپێکردنێکی هێواش و بێ

بەرنامەو جیاجیا، کە تیایاندا سوارە درەوشاوەترینیان بوو.. چونکە سوارە، بە هەموو مانای نوێبوونەوە، نوێبوونەوەی زۆربەی کەرەسەکانی شیعر بوو، کە لە شیعری عەرووزی کوردستانی ئێراندا، مێژووەکەی لە شاعیرانی کلاسیزمەوە دەست پێدەکات؛ تا دەگاتە سەر سەیفولقوزات، هێمن، هەژارو هێدی؛ کە ئەم چوار شاعیرەی دوایی بەگشتیو بەتایبەتیش هێمن و هەژار، نوێنەرو بنەمای قوناغێکی تازەن لە شیعری راچەنین و بەرخۆدان و بەرەنگاریو..گەرانەوەن بۆ سەرچاوە روونەکانی رۆحی شیعری (خانی)و (حاجی قادری کۆیی).

لەدوای (سوارە)، (هاوار)،(چاوە)، (هەڵۆ)،چەند شەپۆل و دەستەیەکی جیاجیای تری شاعیران لەم (٢٠) ساڵەی دواییدا سەرهەڵدەدەن، کە تەمەن و تاقیکردنەوەو پۆلبەندیکردنی ئەم چەند شەپۆلە تێکەڵ و جیاوازە، لەتواناو کاری ئەم نووسینە کورتەدا نییەو.. تەنیا وردە سەرنجی سەرپێیی لە بارەیانەوە بوترێ، ئەوەیە کە ئەگەر وەك ئاکام لە دەنگدانەوەیان ورد ببینەوە، دەزانین تێکرایان جوگرافیای بەرینی شیعری کوردی لە ئامێزیان دەگریو لەهەمان کاتیشدا لە ئەزمون و بزاڤی سەرتاسەری شیعری کوردستانی عێراقیش جیا ناکرێنەوە.. کەلەمەدا سێبەری روانگە -ش بەسەریانەوەیە..بەڵام وەك سروشتی هەموو بزووتنەوەیەکی شیعریی، هەندێ لەم ناوانەی ئەم (٢٠) ساڵە، هەر زوو لە بەخشین و چالاکی شیعر پێشکەش کردن کەوتن و هەندێکی تریشیان زۆر ساردو لاواز هەنگاو دەنێن و هەندێکی تریشیان هێشتا نەیانتوانیوە لەسنووری تەنگەبەری دیالیکت و بن دیالیکتی خۆیان بێنە دەریو هەندێکی تریشیان رێچکەی مەیدانێکی تری ئەدەبییو هونەرییان گرتۆتەبەرو.بە پێچەوانەشەوە دەستەیەکی تریان، بە تەوژم و تینێکی شاعیرانە؛ بەڵام هێورانەو هوشیارانەو بەگیانێکی لیپرسراوانە، لە بەخشین و پێشکەشکردندان؛ کەمارف ئاغایی لەم دەستەیانە..جگە لەمەش ئەگەر وەك جوگرافیا، سەیری ئەم چەند شەپۆلە بکەین، دەبینین ئەزموونی شیعری ئەم (٢٠) ساڵە، تا لەناوەندی ناوچەی موکریان نزیکتر ببینەوە، کەش وهەوای تایبەتمەندێتی شیعری کوردیو باری ناوەرۆکی شیعر، زەقتر خۆی دەنوێنێو.. بە پێچەوانەشەوە، تا لەسنووری موکریانەوە بەرەو ئەردەلان بچین، باری شێوازو روخسارو نزیکبوونەوە لە پەنجەرەکانی ئەزموونی شیعری ئێستای فارسی، نزیکتر دەبینەوە.

لەنێوان ئەو دوو دەستەیەدا، کە (سوارە و مارف) تیایاندا درەوشانەوە؛ پردێکی

بەهێز، بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە، ناوی: جەلال مەلەکشا -یە..کە پشووی درێـژی جـەلالی مەلەکشـا، لای هـەردوو سـەری پردەکـە، لەبـــەرچاوەو هێشـــتا هیــچ دەستیەکیشیان نەیانتوانیوە بەرە لەژێر پێی دەربهێنن، چونکە جەلال ئاگادارییەکی تێروتەسەلی لەسەر رێبازگەکانی شیعری فارسـی بەگشتیو بەتایبـەتیش مێـژووی شیعری کوردی هەیە؛ کەلەم مێژووەدا بەدەنگ بانگەوازی شـیعری خـانیو حـاجی قادری کۆیی -یەوە چووەو جێپەنجـەو رەنگدانـەوەی شـیعری عـەبدوڵلاّ پەشـیو -ی قوتابی ئەو قوتابخانەیەی بەسەرەوەیە..

تەقـەڵلای دژوارو بێپشـووی مـارف ئاغـایی لـەناو بازنـەو شـەپۆلی شـیعری هاوچەرخەکانیدا، بۆ خۆجیاکردنەوەو گەڕان بـەدوای شـوێن پێـی خۆدۆزینـەوەیدا، تینوێتیو پەژارەیەکی بێئۆقرەو بزۆزیدابـوو بـە مـارف، بـەجۆرێك کردبـووی بـە جوانوویەکی هەمیشە یاخیو تینـوو، لـەبیابانێکی قـاقڕو نادیـاردا، کـە هـەموو دەوروبەری خۆی بـە تراویلکەیـەکی بێسنوور دەزانـی.. حـەزی نـەدەکرد بەسـەر لاپەرەکانی مێـژووی چـەندان بـارەوەبووی خۆیـدا، غارغـارێن بکـات.. لەهـەموو مێژووی خۆی تووڕەو دردۆنـگ بـوو.. خـۆی دەدرانـدو دیسـانەوە ئـەزموونی خـۆ نووسینەوەیەکی تری دەکرد.. لەماوەی ئـەم (١٠) سـاڵەی دوایـی تەمـەنیدا، کـە شیعر خۆراکی رۆحـی بـوو، چـەند جـارێك کۆمەڵـە شـیعرەکەی خـۆی بـۆ چـاپ کۆکردەوە..لەهەموو کۆکردنەوەیەکیدا، چەندان شیعری لێ هـەڵدەبواردو..شـادمان بـوو کـە زوو چاپی نـەکردن..ساڵی (١٩٩٤ز) بـۆ جـارێکیتر بـەناوی (پـردی برووسکە)ی کۆکـردەوەو ودمـی لـەچاپدانی وەرگـرت و ئـەمجارەش هـەر پەرۆشـی لەچاپدانیان نەبوو..

تا سەرەتای ساڵی(١٩٩٨ز) کە لەسەر تکای من و کاکـە موحسـینی خـالیدی هاوڕی شاعیرو هاوکاری، سـەر لـەنوێ دەستی تێوەردانـەوەو هـەندێکی تریـانی هەلپرتاونەوەو ئەمجارەیان ناوەکەیشی گۆڕیو کـردی بـە:(زەوی سـەخت و ئاسمـان دوور) ... ئەو رۆژانەی ئەم کۆمەڵە شیعرەی ئامادەی چـاپ دەکـرد، قەسـیدەیەکی درێژ هێشتا تەواونەکراویشی بەدەستەوە بوو، بریتی بوو لەباری سەرنجی شاعیرانەی خۆی، بەرامبەر بە رووداوەکانی ئێستای نیشتمانەکەی... دوو شەو بەر لە مـەرگی، لە ماڵی خۆیان لە ورمێ، بۆمی خوێندەوە... لەو قەسیدەیەش نابەدڵ بـوو...حـەزی دەکرد زۆرتر لە گەڵیدا بژی و گینگل بـدات و دەسـتکاری زۆرتـری بکاتـەوە.. بـە

جۆرێك تا ئەندازەی ئەوەی حەزیدەكرد لەو شیعرەدا بكەوێتە بەر مێژووی ئێستای نیشتمانەكەی... چونكە من پێم وایە: شـعری گـەورە، لـە جیـاتی ئـەوەی مێـژوو بەجێی بهێڵێ، خۆی مێژوو بە جێدەهێڵێ... تەنانەت بە هۆی بزووتنەوەی ئەفراندن و داهێنانییەوە، بزووتنەوەی مێژوو دروست دەكات... لەبەر ئەوە ئەو جۆرە شـیعرە گەورانە، لە جیاتی ئەوەی رووداوێك بۆ ئێمـە بگێرنـەوە، خۆیـان دەبنـە رووداو... خۆیان دەبنەكارەسات... هەربۆیە لە جیاتی ئەوەی لە رابووردووەوە قسە بۆ ئێمـە بكەن، لە داهاتووەوە بۆمان دەدوێن... لە مجۆرە شیعرە گەورانەدا - كە خۆیان دەبنە مێژوو- ، ئاسایی دەچێتە كەنارو داهێنان و ئەفراندنی نوێ دێتە ئاراوە، بۆیـە لـە جیاتی زمانی مێژوو، زمانی شیعر دێتـە گـۆ... كـە لـەم لەدایكبوونـە نوێیـەدا، زمانی شیعر، زمـانی شـیعراندن و هونـەراندنی مێـژووە... زمـانی چڕكردنـەوەی تێڕوانینە... زمانی رووبەڕووبوونـەوەی گـەردوونو نهێنییەكانـە... چونكـە زمـانی شیعر، بەپێچەوانەی بوارەكانی تری ئەدەب، زمـانی نوێكردنـەوە توانـاو مـەودای واژەیە... لە كاتێكدا زمان لە بەشكانی تری ئەدەبدا، بۆ گـەیاندنو روونكردنـەوەی مەبەستو پەیامی نووسەرەكە، بەكار دێت... كە بەمەش زمـان، وەك سـووتەمەنی لێدێت... واتە: وەك چۆن نەوت، بەنیازی رووناكاییو گەرمكردنـەوە، بـەكار دێـت، زمانیش لە بوارەكاتی تری ئـەدەبدا، هەرتـەنیا بۆگـەیاندنی پـەیام و مەبەسـتەكە بەكار دێت... بۆیە دوای گەیاندنی مەبەسـتەكە، زمانەكـەش لـەناو نووسـینەكەدا دوایی دێت... بەلاّم لە شیعردا، زمان لەو كاتەوە مانای بەبەردا دەكرێـت، كـە لـە بناغەو هەڵچنینی شیعردا بەكار دێت...

هەر لە بەرئەمەیە، كە لەزمانی خواستەمەنیو ئامرازەكانی شیعری مـارف ورد دەبینەوە، هەست دەكەین بەدوای كۆمەڵە كەرەسەیەكدا دەگەڕێ، جیاوازتربێت لـە كەشـو هـەوای شـیعری هاوڕێكـانی... چونكـە دەیزانـی كەشـو هـەوای شـیعری هاوڕێكانی، جگە لەوەی زۆربەیان لاسایی یەكتر دەكەنـەوە، لـە هـەمان كاتیشـدا زۆربەیان گیرۆدەی سێبەری هەندێ لووتكەی شیعرو ئەزموونی شاعیرانی تـرن، كـە تۆێژاڵێكی تـەنكی رۆمانسـییانە، كۆیـان دەكاتـەوە... لـەم مەیدانـەدا تەقـەللای مارف، تەقەللایەكی چەند لایەنەو تەنگوچەڵـەماوی بـوو... تـابتوانێت خـۆی لـەو هەموو میراتە ئیقلیمگیرە دەرباز بكات... بەتایبەتیش خۆ دەربازگردن لە جێپەنجەو سێبەری لووتكەی شیعریی... كە ئەم میراتەیان لە مێژووی شیعری هەموو گـەلانی

دنیـادا، تادەرنگـانێ بەسـەر ئـەزموون و مێـژووی شـیعری نـەوەکانی دواتـــرەوە جێدەمێنێ... وەك چۆن بۆن و بەرامەو هەوێنی شیعری دیالیکتی گۆران بەگشـتیو بەتایبەتیش شیعری (مەولەی تاوەگۆزی)، بەسەر شـیعری (پیرەمێرد)و عـەبدوڵڵا گۆران-ەوە دیارە، هەر بەو جۆرەش رەنگدانـــەوەی شـیعری حـاجی قـادری کۆیـیو پیرەمێردو (عەبدوڵلاٚ گۆران)یش، بەسەر ئەم قۆناغەی شـعری کوردیـیەوە دیـارەو هێشتا خۆ رزگارکردن لە سـێبەری ئـەو چـەند لووتکـە بڵنـدە، رەنجـو نەسـرەوتنی زۆرتری دەوێ، کە مارف ئاغایی، بە ئاگادارییەکی زۆرەوە لە گەنجینیەو ئەزموونی قوناغەکانی شیعری دەروانیو بەندی زۆری لێوەردەگرتن... بەلاٚم بەو مانایە نا، کـە لەم ئەزموونی(١٠) سال شیعر نووسینەیدا توانێبێتی شەقڵو مۆرکێکـی تایبـەت و جیاواز، بۆ دەنگ و رەنگی خۆی پێکەوە بنێو ئۆخژنی هاتبێ... بـەڵکو گـەڕان و سۆراخ و یشکنینی بێ ئارام و نەپساوی لەم پێناوەدا، توانیبـووی سـەرەنجی شـیعر دۆستانی خۆی، بـەرەو ئـەوە بـۆلای خـۆی رابکێشـێ، کـە ئـاوڕ لـە تەقەڵلاکـەی بدەنـەوە... بەتایبـەتیش کورتکردنـەوەو چڕکردنـەوەی زمـانی شـیعری مـارف، دیارەدیـەکی ئاشـکراو بـەرچاوی تەقـەڵلاکانێتی، کەدەیـــەوێ بەکـەمترین واژەو کورتترین رستەو دەربرین، فراوانـترین روانینـی خۆیـان پـێ بڵێـت؛ کـە سـەرتاپای روانینەکانی بریتی‌یە لە خوێندنەوەیەکی دووبارەی مێژووی خۆیو.. لەم مێژووەشدا تەنیایی خۆی لەناو بازنەبەکی گـەمارۆدراوی چەقبەستوودا دەبینـیً؛ کـە گیـانی بـەرگریو دەربـازبوون لـەو بازنەیـە؛ رۆحێکـی هەمیشـە سـەنگەرگرتووی تێـدا دروستکردووەو..لەبەرامبەریشیدا، ئەوانەی گەمارۆیان داوە، هەمیشە وای نیشـان دەدەن کە گیانلەبەرێکی تەنیاو تەریك و سەرچڵ و یاخیو دوورە ژیـار و دەرکـراوی مێژووە:

تەنیاترین مرۆڤی نێو قەرەباڵغی ئەم دونیایەم
بـــاسی رۆحـــم دەکـــــەم رۆحـــم
بێکەســـترین لـەدایکبووی سەر ئەم خاکەم
دە بــــەس قـــاقـــام بۆ بکێشــــە
بـــاسی شـــیـــعرم دەکەم شیـــعرم

(ناسنامە)

لــــــــــــەم مــــــێژووە پـــــڕ دووکـــــەڵــــە
چۆن دووکەڵی مـــــــاڵ سووتان و تۆپباران و کیمیاباران
لـــــــــەنێو ئــــــــــــەم رووبـــــــارە ڵــــێڵە
چلۆن ئاو و فرمێسك و خوێـــــــن، لەیەك جیا دەکەیتەوە؟
تۆ، لــــــــەنێو خەمنی ژیـــــان دا دەخولــــــێنێتەوە

(خەون)

مێژوومان شیعرێکە: لە هەوەڵ بۆ ئاخر، لە ئاخر بۆ هەوەڵ
خوێندنەوەی هەریەکە
مێژوومان دەســـــتێکە، دەیــــــان جار، لەیەك کون،
مار پێوەی وەداوە

رێبـواری نێو مژێکی خەستەو..
دەیان جار هەر دەوری خۆی داوە

(سەفەری مەرگ و ژین)

بەڵام مارف، مێژووی خۆی بە دیدێکی شارستانییانە دەخوێنێتـــەوەو هـــەر بـــەو دیدەشەوەە لەسەرەتاو قووڵایی مێژووەوە گوێ لــە بانگــەوازی مرۆقــی ئەشـکەوت نشینی نیشتمانەکەی خۆی دەگرێ؛ تا دەگاتە مێژووی ئەم رۆژگــارەی، کـە لەســەر شەقامی قیرتاو و ساڵۆنی کۆبوونەوەی فەرهەنگی جیاجیــای گــەلان و نەتــەوەکانی دنیاوە، قسەی نوێو بیری نوێــی مرۆڤدۆســتانەی گەلەکــەی، بــەتواناو ئیرادەیــەکی پتەوەوە، بۆ گەلانی دنیا بـــاس بکــات و لــە هــەموو باسکردنیشــیدا بیــەوێ ئــەم پەیامەی بــە هونــەری شــیعر دەربخــات نــەك بەقســەی رووت و دروشــمی سیاســیو پارانەوەو لالانەوەی رۆمانسییانە، کە بۆتە سیماو رواڵەتێکی زۆرینەی شیعری ئــەم سەردەمە.. هەرچەندە من پێم وایە هــەوێنی رۆمانســییانە، لەهــەموو شــیعرێکی گەورەدا هەیە؛ بەڵام پارانەوەو کڕووزانەوە، لەناو شیعری رۆمانسییانەدا، نیشــانەی بێتواناییو تێشکان و هەرەسهێنانی ورەی مرۆڤە، لەبەردەم چارەنووسی خۆیدا، کە ئەگەریش مرۆڤایەتی ئاورێك لەو جۆرە کرووزانەوانە بدەنەوە یـــان گوێــی لێبگــرن، هەر بەتەنیا بەگیانی بەزەییو سۆزەوە لایەکی لێدەکەنەوە.. کەئەمــەش ئــەوەندەی

تۆسقاڵێك چارەسەری بنچینەیی چارەنووس و کێشەی ڕەواو خوازیارە مرۆییەکانی ناکات.. بەڵام ئەگەر شیعری مارف توێژاڵێکی تەنکی ڕۆمانسییانەش لە ئامێزی گرتبێ؛ لەهەمان کاتدا سیماو ڕەگەزەکانی شیعری مارف، ڕاچەنین و بەرخۆدانێکی تایبەتییان تێدایەو نایانەوێ لاسایی‌و چاولێکەریی سەرومڕی ئەم سیما گشتییانەبن، کە زۆرینەی شیعری دەوروبەرەکەی دەرژێنێتە یەك ڕووباری هاوبەشەوە؛ بەڵکو تەقەللایەکی بۆ مەلەکردن بە پێچەوانەی ڕەوتی ئەو ڕووبارە.. تەقەللایەکە بۆ جیابوونەوە لە کاروان و سەرپێچکردنی مەرجەکانی خێڵ.. تەقەللایەکە بۆ گۆرانی‌چڕین بەتەنیا؛ نەك لەناو دەستەو کۆرسێکدا.. کە مارف ئاغایی بەوپەری دڵنیایی‌و هۆشیاری‌یەوە دەیزانێ ئەم تەقەللایە، بەرەو تەنیاو دابرانی دەبات و لەهەموو قووڵایی هەستیەوە، هەستی بەتەنیایی دەکرد:

شەوەکانم پڕن لە تەنیایی من و بێ تۆیی تۆ

ئەوە چراکەم کوژاندەوە، چاوم وێك نا، هەموو دنیام فەرامۆش کرد، ئەوە خەوتم

بەڵام چ بکەم، خۆ هەر شەونا

خەوەکانم پڕن لەتەنیایی من وبێ‌تۆیی تۆ

(بێ‌تۆیی)

چەند ساڵێکە دیوانم پڕە لەشیعرو

هیچ خوێنەرێك نادۆزمەوە

کە فرمێسك و ئاواز وشیعرم جێ‌بێڵم

(تەنیا)

لەتەنیایی بەربەرین و بێ‌برانەوەی ڕۆحی خۆمدا دەتلێمەوە

هیچ کەس نییە خەونەکانم بڕوا بکاو

من دەترسێم

(تەرزە)

دایە، دایە سەر هەڵدەگرم

مەڵێ: بۆ کوێ؟

سەرهەڵگرتن شوێنێکی تایبەتی نییە

هەر دێمەوە.. مەڵێ: کەنگێ؟

گەرانەوە.. کاتێکی تایبەتی نییە

(تینوو)

خەونـــــەکـــــانم ونیـان کردووم
رۆحێکی سەرگەردانم و چـاوەڕوانم
کە یا خنکان و یـــــــا سووتان
بە بلێسە... یا بە شـەپۆلم بسپێرن.

(ونبوو)

ئـەم گیـانی تەنیاییـەی شـاعیر، کەلـە ئاکـامی هـەڵوەداییو گـەران بـەدوای ناسنامەیەکی تایبەتیو جیاوازدا، لەبەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە، بـەرای مـن، ترس و گومانێکە، کەلە نەستی شاعیردا دروست بـووە.. ئـەم تـرس و گومانـەش بەرئەنجامی ئەندازەو رادەی وەرو بوێرییی شاعیرە؛ بۆ جێهێشتن و تێپـەراندنی ئـەو سـنووری کـەش و هەوایـەی، شـیعری سـەردەم و ئـەو شـەپۆلە شـیعرییەی لەئامێزگرتووە؛ کە ئەم شاعیرەی تێدا دەژی..واتە: شاعیر چـەند دەیـەوێ لەیاسـاو تایبەتمەندییە گشـتییەکانی شـیعری دەوروبـەری یـاخی بێـت و دوور بکەوێتـەوە ؛ ئەوەندەش هەست بە تەنیاییو تـرس و گومـان دەکـات.. وەك ئەوانـەی دەیانـەوێ لەزیندان هەڵبێن، یان ئەوانەی دەیانەوێ لەیاسـاو نـەریتی خێـڵ یـاخی بـن، یـان ئەوانـەی دەیانـەوێ لـەکاروان دوور بکەونـەوە.. کەبـەدەم دوورکەوتنەوەیانـــەوە، بانگەوازو هەرەشەیەکی نـهێنیو شـاراوە، لـەقووڵایی رۆحیـاندا ئابڵوقـەی داون و بانگیان دەکاتەوە، بۆ گەرانـەوە بـۆ ئـامێزی ئـەو کۆمەڵـە پێوەنـدیو بـیرەوەریو پاشخانە فەرهەنگییەی پێی پەروەردە بوون؛ کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ئـەم دیاردەیـە لـە ئـەدەب و هونـەرو بوارەکـانی تـری کۆمەڵایـەتیدا، بەئـەنجام و دەرهاویشتەی رەنگدانەوەو جێپەنجەی مـیرات و کولتـوورو فەرهـەنگ و نـەوەکانی پێشووتر بوون لەسەر یەکتری.. یان بەواتەیەکیتر: هەموویان بەرودوا لـەمنداڵدانی پێشینەی یەکتریدا لەدایك بوون..بۆیە کاتێکیش بە شـاعیرێك دەوترێـت: خـاوەنی دەنگی تایبەت بە خۆیەتی؛ بەڵام لەهەمان کاتیشدا هێشتا هەموو لایەنەکانی ئـەو دەنگە تایبەتەی، تایبەت نابێت و بەداهێنان و توانای ئەو سـاتەوەختە خێرایانـەی ئەو شاعیری، شیعریان تێدا دەنووسی..بەڵکو پێبزانێ، یـان نـەزانێ، بیـەوێ، یـان نەیەوێ؛ زەبرو رەنگدانـەوەی چـەندان ئـەزموون و کەلـەپووری چـەندان سـەردەم و فەرهـەنگی پێشـینەی خۆیـەتی؛ کەلەنەسـتی شـاعیردا، کەڵەکـەبوون و لەسـاتە

بروسکەییەکانی ئیلهام و لەدایك بوونی بەرهەمەکانیدا، بەشێوەی نادیارو شاراوە، دەرژێنە داهێنانەکانییەوە.. چونکە ئەدەب و هونەر، بەرینایی کۆمەڵە هەڵکشانێکی ئاسۆییە، لەگەڵ ناخی مرۆڤ هاوتەریب، بەرێدەکەوێو هەرگیز لەهیچ سەردەمێکدا دابڕانی تێناکەوێو قوناغی لێنابێتەوە.. لەبەر ئەوەی هەرچی ئەو قوناغ و دابران و دەستەبەند بکردنانەی دروستکراون، رەخنەو دەقی رەخنەیی دروستی کردوون.. بۆیە بۆ وێنە: کاتێ بە شاعیرێکی گەورەی وەك عەبدوللا گۆران دەڵێین: شاعیرێکی نوێخوازەو..لەسەرومری کەرەسەکانی نوێخوازییەکەی ورد دەبینەوە؛ سەرنج دەدەین سەرەرای ئەو هەموو دەسەلاتە مەزن و ئاگادارییەی لەسەر شیعری تازەی ئەوروپا و گەلانیدراوسێو یاخیبوونە جوان و گەورەیەی (گۆران) لەبەرامبەر کۆت و پێوەندەکانی شیعری پێشینەی خۆیدا ئەنجامی داوە..کەچی هێشتا دەیان مەرج و مۆرك و یاساگەلی شاعیرانی پێش خۆیو بەتایبەتیش شاعیرانی دیالیکتی (گۆران)، بەسەرجەمی شیعرەکانییەوە ماون و..لەسەروو هەموشیانەوە: کۆت و پێوەندی کێش وسەروا ی سەدان ساڵەی شیعر، کە ئەگەرچیش (هەندێ) لەو وەزنانەی (گۆران) بەکاری هێناوەن، بنەچەکەیان کوردییە، بەلاّم لەهەمان کاتیشدا هەر بریتین لەو کۆمەڵە مەرج و رێسایەی لەدیرزەمانەوە ، لە ئەستۆی شیعر بار کراون.. بۆیە گۆران بۆ گوێرایەڵی و پەیرەو کردنی کێش و سەروا، قوربانی داوە بە زۆر کێشەی گەورەتر لە کێش و سەرواو..تەنانەی ئەوەندەی پابەندی کێش وسەروایە، ئەوەندە دەربەستی ناوەرۆك نییە. بۆیە لەزۆر شیعردا، ئەگەر (کێش وقافیە)ی لیێ بسێنینەوە، هیچی پێنامێنێ..لەکاتێکدا وەك دەزانین گەوهەری شیعر، بریتی نییە لە کێش و سەروا..بەڵکو بریتییە لە کۆمەڵێك شتی قووڵترو مەزنتر لە کێش و سەروا.. بەتایبەتیش روانینی تازە بۆ ژیان و ئازادیو تەقاندنەوەی ماناو مەودای تازە بۆ واژەو وروژاندنی کێشە بنچینەییەکانی مرۆڤی سەردەم بەگشتی...

خۆ ئەگەر قۆناغی دوای (گۆران)یش، وردە تەقەللای تریان دابێت بۆ ئازادکردنی شیعر، لە کۆت و پێوەندی کێش و سەروا، بەلاّم هێشتا کێش-وەزن، بارێکی گرانی جەستەی شیعری کوردییەو شەرومڕی شاعیرانی ئێستا، گیرۆدەی ئەم مەرجە ئەفسانەییەن و... ئەو شەپۆلە شاعیرەش کە (مارف) تیایاندا دەبینرێ، هێشتا ئەم تەلسیمەیان پێ نەشکاوە... لە کاتێکدا نزیکەی (١٥٠) ساڵ بەر لە

ئێستا، شاعیرانی وەك : شارل بۆدلێر (١٨٢١- ١٨٦٧ز) لە فەرنساو والت وایتمان (١٨١٩- ١٨٩٢ز) لە ئەمەریکا، سنووری نێوان شیعری کێشدارو پەخشانیان بەزاند... چونکە کێش یەکێکە لە مەرجەکانی نەزم، نەك شیعر... لە بەر ئەوەی کێش ؛ چەند بریتییە لە مەرج، ئەوەندەش مەرجێکی ئاسایی و ئامادە و چاوەروانکراوە... لەکاتێکدا گەوهەری شێعر کێش ناخوازێ؛ واتە: کێشێکی دیاریکراو ناخوازێ... بەڵکو جۆرە مۆسیقایەك دەخوازێ، کە لە هەناوی ئاهەنگ و چرپی شیعرەکەوە ، زۆر سرووشتییانە هەڵدەقوڵێت ... بۆیە ئەوانەی پێیان وایە: شیعر، بێ کێش نابێ، ئەوانە شیعر، لە نەزم نزیك دەخەنەوە، چونکە هەر نەزم،بێ کێش نانووسرێ..ئەمە جگە لەوەی کە کێش کۆمەڵە ئەندازەو پێوانەی پێشتر ئامادەکراوەو هەموو کەسێك (ئەگەر شاعیریش نەبن) دەتوانن فێری بن..بەلاّم ئەو مۆسیقا شاراوەو نادیارەی لەشیعری ئازاددا پێی ئەوترێ: ریتم (Rhythm)، و (عەبدوللا گۆران) ناوی ناوە:(ترپە) دەسەلاّتی داهێنەرانەی شیعر، دروستی دەکات و هەموو کەس فێری نابێت.. لەبەرئەوەی بەرای من، یاخیبوون لە کێش ئازایەتیو هونەری زۆرتری گەرەکە، لەوەی چەند کێشێکی پێشتر ئامادەکراو، ببنە کەرەسەی شیعر! کە ئەمەش وەك ئەوە وایە بلێین: کێش کەرەسەیەکی ئامادەیە، شاعیر لەکاتی شیعر نووسیندا پەنای بۆ دەبات..کەچی ریتم، ئەو کەرەسەیە؛ کەلەگەلّ لەدایکبوونی شیعرەکەدا، دروست دەکرێ. واتە کێش، ئامرازو خواستەمەنییەکە، لەدەرەوەی شیعرەکەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەوەی شیعرەکە..بەلاّم ریتم لەناخی شیعرەکەوە لەدایك دەبێ..لەدایك بوونەکەیشی بەگوێرەی باری دەروونی شاعیرەکەو شێوەی هەلّچنینی پیت و واژەو رستەوە لەدایك دەبێ.. بۆیە شیعری ئازاد، ریتمی گەرەکە، نەك کێش.. کە ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ هەرکەس لە کیش یاخی بێت، دەتوانێ شیعر بنووسێ! هەروەك چۆن هەرکەس شارەزای کێش بێت، ناتوانێ شیعر بنووسێت..هەر لەبەر ئەمەشە، زۆرجار لە گریانێکی قوولّ و راستەقینەدا، هەوێنی شیعر دەبینرێ..یان هەندێجار ئەوەندەی لەنامەیەکدا، شیعر هەیە، لە شیعرێکی کێشداردا نییە..وەك نموونەی پێشەکی (تاریك و روون)ی شاعیری گەل، مامۆستا هێمن، کە ئەوەندەی شیعر لەو پێشەکییەدا هەیە؛ ئەوەندە شیعر، لە شیعرەکانی سەرەتای شاعیرێتی (هێمن)دا نییە.

ئەگەر لەم بوارەدا، شاعیرانی دوای شەپۆلەکەی مارف، بوێرانە هەندێ تەقەڵلایان لەم مەیدانەدا دابێت، بۆ خۆرزگارکردن لە سام و بیمی کێش؛ بەڵام هاوکات هەست دەکرێ ئەم شەپۆلەی دواییش، دەسەڵاتی بوێرانەی بەسەر لایەنی (زمان)دا، هێشتا لاوازەو هێشتا چاوەروانی کەمیان لێدەکرێ؛ بۆ خۆرزگارکردن لەو زمانە دەقگرتووە؛ چەقبەستووە؛ باوەی لەسەردەمی (گۆران)و (پیرەمێرد)ەوە تا ئێستا، خەریکە بلێم: لە ناسنامەیەکی گشتی و ئیقلیمگیری هەموویان دەچێ.

ئەم ئاکامە گشتیانەی شیعری کوردی ئێستا؛ ئەوەمان لا گەڵاڵە دەکەن بڵێین: ئەگەر ئەو هەندە تەقەڵلا کەم و دەگمەنانەی (لەچاو ژمارەی زۆری شاعیراندا) لەم چل - پەنجا ساڵەی دواییدا، وەك بارانێکی بەهارانەی شیعری کوردی بن؛ ئەوا دەسەڵاتی دەنگ و رەنگ و رەگەزەکانی قۆناغی (گۆران)، هێشتا وەك پەلکەزێرینەیەکی بەربلاوی ئاسمانی ئەو بارانە شیعرانەن.. کە ئەگەر جیاوازیی لەنێوان قۆناغی (گۆران)و تەقەڵلاکانی دوای (گۆران)دا بەراورد بکەین، دەبینین دیارترین و ئاشکراترینی ئەم جیاوازییانە، لایەنی (زمان)ە، کە مانا و مەودای (واژە)، لە قوناغی (گۆران)دا، (واژە) هەر ئەو مانا سادەو باوەی هەیە، کە لە دێرزەمانەوە لە فەرهەنگ -قاموس دا هەیە..لەکاتێکدا لە تەقەڵلاکانی دوای قوناغی گۆران-دا، تێکۆشان بۆ پشکنین و دۆزینەوەی مانای چەندین لایەنەو توانای دەربرینی تازەی (واژە) دەدرێ.. بە واتەیەکی تر: ئەزموونی ئێستای شیعری کوردی ئەم (٢٠) ساڵە، وەك ئەو رووبارە درێژانەیە، تاڤگەو گێژەنیان زۆر کەم بێت.. شیعری کوردی ئێستاش، ئەزموونێکی لەیەکچووی یەکپارچەیە، کە راچەنین و بوومەلەرزەو گڕکانی تاقیکرنەوەی نوێو دەگمەنی کەم تێدایە، تامێژووی ئەم ئەزموونە، لەیەکتری دابڕێو قۆناغی نوێ دروست بکات.. چونکە کە دەڵێین: قۆناغ، واتە مەبەستمان ئەوەیە دابرانی ئاشکراو بەرچاو لەو ئەزموونەدا هەبێت؛ لەکاتێکدا دابران، بەمانای تێپەراندن و جێهێشتنی قۆناغ و سەردەمێك، لەهەموو فەرهەنگ و دیدو تیۆرێکەوە؛ کە ئیتر ئەو ئەزموونە نەگەرێتەوە سەر هیچ یەکێك لەو شتانەو پێویستی پێیان نەبێت..یان روونتر بڵێین: دەبێ ئەو ئەزموونە، لە سەرجەمی سیستەمی پێوەندیگەلی کۆمەلایەتی دابڕێت و پاشخان و سەرخانی فەرهەنگی کۆمەلایەتی بخاتە ئەولاوە.. کە بە پێچەوانەی ئەمەوە: ئەدەب بە گشتیو شیعر بە تایبەتی، دەرئەنجامی خرۆشان و هەڵچوونە زۆر دژوارو

سەختەکانی ناخ وهەناوی مرۆڤە؛ کەناخی مرۆڤیش هەمیشەو هەمیشــــە، شـانازی بەو سەروەریو رووداوگەلە مەزن و دەگمەنانەوە دەکـات، کـە لەمێژینـەی خۆیـدا، بەهایان پیرۆزەو یادگاری مەزنن.. لەسەروو ئەمانەشەوە، ئەدەب و هونەر دابراو نین لە رەنگدانەوەی گوتاری سیاسی؛ کە گوتـاری سیاســی کـوردی، لـەم چـل - پـەنجا ساڵەی دواییدا گۆرانکارییو (دابران)ی تازەی لە مێژووی خۆیدا دروست نـەکردووە..

بۆیە هەر بەم پێودانەش لەم چل - پەنجا ساڵەی دواییـدا، تێپـەراندن و جێهێشـتن و دابرانێکی سەرتاسەری زۆر کەم لە شیعری کوردیدا بەدی دەکـرێ.. تـەنیا ئـەوەندە هەیە کە شیعری ئێستای کوردی (جگە لەگۆرانکاری لەبوار زماندا)، تامەودایەکی کەمیش بیٚبـەرییو دابـراو نییـە لـە حـەزو خۆزگـەو خـەیاڵی سـەردەمی نـوێ..و ئەمانەیشی هەر لە روخساردا نیشـان داوە، نـەك لـە دیـدو روانینـدا..کەئەمـەش رێسای هەموو کولتووری دنیایەو ئەو لووتکە بـەرزو نەمرانـەش، کـە لـە ئـەدەبی دنیادا هەڵکەوتوون زۆربەیان شێوازو ئـامرازی تـازەی دەربرینیـان داهێنـاوە؛ نـەك ناوەرۆکی تازە، کە هەر بۆ وێنە دەڵێین: رۆمـانی (سـەد سـاڵ تـەنیایی)ی گـابریل گارسیا مارکیز، سۆنگەی ناوبانگەکەی لەوەدایە کە بە تـازەترین شـێوازو خـوازە، قوولترین رەگ و ریشەی خۆی لەناو کۆنترین میتـۆدی گەلەکـەیدا دۆزییـەوە..یـان (عەبدوللا گۆران)، بەتازەترین شێوازو خوازەی نوێ، قوولـترین رەگـی خـۆی لـەناو مێژووی شیعری دیالیکتی (گۆران) بەگشـتییو بەتایبـەتیش لەشـیعری (مەولـەوی تاوەگۆزی)دا دۆزییەوە.. کە ئەمەش خۆی لـــە خۆیـدا، ئـەوەندەی گەرانەوەیـە بـۆ مێژوو؛ ئەوەندەش تەقەللای خۆرزگارکردنە لە کۆت و پێوەندی مێژوو.. یان زاخـاو دانـەوەو ئارایشـتکردنەوەی مێـژووی کۆنـە، بـە شـێوازێکی تـازە.. کـە لـەمجۆرە داهێنانەدا، خوێنەر زۆر درەنگ و بەدژواری هەست بە پردی نێوان ئێسـتاو دوێنـی دەکات؛ یان هەر ناتوانێ بیکات، چونکە ناتوانێ بەراورد لەنێوان دەقێکی ئێسـتاو دەقێکی رابووردوودا بکات؛ بە تایبـەتیش ئەگـەر ئـەو دەقـە دەقـی نەتەوەیـەکی جیاواز بێت؛ کە خاوەنی میتۆدو کولتووری جیاوازن. لەبەرئەوەی ئەمجۆرە داهێنانە، دەرئـەنجامی هەڵتـەکاندن و رووخـاندنی داروپـەردووی رۆح و سـەرلەنوێ دامەزراندنەوەی رۆحە؛ بەرۆح وخەونی تازە.. کە مخابن، شـیعری کـوردی، زۆرکـەم وەدەگمـەن توخنـی میتـۆدو فۆلکلـۆر ومۆسـیقیو بـەیت و مێـژووی پێوەنـدی کۆمەلایەتی کوردی کەوتووەو لەم بوارەشدا بـە پێچەوانـەی ئـەوەی ئـەو شـتانەی

رابوردووی خۆی لە ئێستادا بخوێنێتەوەو دووبارە لێیان تێپەڕێنێو دابڕێ.. کەچی لەبەردەمیاندا دۆش داماوە..!.. هۆیەکەیشی ئەوەیە، کە زۆرکەم ئاگاداری میتۆدو کەلەپووری دێرینەی خۆیەتی، بۆیەش ناتوانێ بە شێوازی ئێستا، ئارایشتیان بکاتەوە!.. کە ئەمەش مایەی هێشتنەوەی شیعری کوردی ئەم سەردەمەیە، بەهەمان کەرەسەو ئامرازی قۆناغی (گۆران)ەوە، بەلاّم بەهەندێ جیاوازی بەرچاوەوە، کەوەك وتمان دیارترینیان لایەنی (زمان)ەو..خۆشبەختانەش لەبواری باسکردنی (زمان)دا، دەبێ بڵێم: مارف تەقەڵلای بوێرانەو جیاوازی هەیەو ئەگەر بەوردی سەرنج لە شیعرەکورتەکانی بدەین، هەست دەکەین دەیەوێ بە کورتترین و چرترین واژەو وێنە، مانای قووڵ و ڕەمزاویمان پێ بڵێت..

دیاردەیەکی تری شیعری مارف، بابەتی (مردن)ە، کەوەك تەم و تارایەکی تەنك، بەسەر زۆربەی شیعرەکانیەوە دەبینرێن؛ لەو نموونانە:

بەرواڵەت: گەنجی گەنج
بەدەروون: پیری پیر
دەترسێم زۆر زووتر ناچاربم، دەروونم
لەم دیوی رواڵەتم بنێژم
(چارەنووس)

بارانی مردن
لەدەوروبەرم بەخوڕ دەبارێ
– باری زەمان بەلەز، لەبەری هەڵدێ
((بەباو بەباران، هەر عومری بەفر کەم دەبێتەوە
(تەنگەبەر)

لەسەر تەختی وەرزێکی زەرد دادەنیشێ میری پایز!
ئا..ی چ پایزێکی ناوەخت
( ڕوودا و)

شین، زەرد وسپی
ڕەنگی تەمەنی یەکساڵەی سرووشت
منداڵ، لاوو پیر
ڕەنگی تەمەنی یەکجاری مرۆڤ

ئا..ی لەکوێی، لەکوێی: تازەبوونەوە!

(قۆنـــاغ)

سووتان. لەمێژبوو بەدواتدا وێڵ بووم
تۆش ئەی خۆڵەمێش
چ رۆژگارێکە شوێنت هەڵگرتووم!

(بەرئاگردان)

ئەمەکێ بوو
بەردی گرتە ئاوێنەی نێوچاوانی من
چرژی تێخست؟
ئەوە کەنگێ وەرز گۆرا
تووکیسەرم، لەداری بەژنم هەڵوەری، گەڵا، گەڵا
ئەوە لەکوێ، زەریا دڵی وەکوڵ هات و
لێرە، هەور، بەسەر باڵای مناگریا؟

(پرسیـار)

کە دەستی دار، یەك یەك گەڵاکانی وەری
کە ئاسمان، کلوو..کلوو بەفر لەچاوی هەڵوەری
منیش لێرە، لەتەنیایی ژوورەکەما
تار تار موویسەرم هەڵوەری

(هاودەردی)

چاوم بەدەشتی قاقڕ هەڵنایە
خوێنم پێشکەشتان
ساڵی داهاتوو رۆحم دەنێرم، بۆ باخەوانی گوڵزاری لالە

* * *

لەودیوی پەنجەرەکەدا:
چنارێکی گەڵا وەریو هەڵدەلەرزێو
بایەکی سرِی پاییزی لەپێش چاوی گەڵاکانی
نوقمی گەردەلوولی دەکا
لەمدیوی پەنجەرەکەدا:

کەسێ دیارە، دوایین دەستەچیلەی یادی
بەئاگری تەنیایی خۆی دەسپێرێو
وردە وردە خامی سپی، بەسەرخۆیدا هەڵدەکێشێ
(تەنیایی)
مرۆڤ کەمرد، لەنێو کفنێکی سپیدا، دەپێچنەوە
سرووشت کە مرد، لە بەفرێکی زستانیدا.. دەیشێرنەوە
(بــەفر)

مردن دەرگای دەکاتەوە
وەك چۆن گورگێکی چاوبرسی
بۆ نێچیری، زار لەبەریەك دەکاتەوە
(سێ هەنگاو تامەرگ)

ئەمە لە کاتێکدا ئەوانەی وەك ئێمەومانان، کە ئاشنای ئێجگار نزیك و دەرگــا بێ کلیلەکانی رۆحی یەکتری بووین، هەرگیز و کەم وزۆر، هەستمان بــەوە نــەدەکرد ئەم تارمایی مردنــەی نــاو شــیعرەکانی، زەبــرو جێپەنجــەیان لەبەرنامــە هەمیشــە دەوڵەمەندو پڕ ئاوات و خۆزگەکانی هەبێت.. بەڵکو بە پێچەوانەوە؛ بەکوڵ و بــەدڵ شەیداو ئەویندارى ژیانی نوێو کاری نوێ، پەیداکردنی هاورێی نوێ بوو.. هــەموو رۆژێك هاورێیەکی تازەی دەگرت، کەلەم مەیدانەدا مــارف، لــەچاو ئێمــەو لــەچاو هاورێکــانی نــاو دەســتەی نووســەرانی گۆڤــاری (ســروە)دا، کــە چالاکــترین و پڕکارترینیان بوو؛ زۆرتریــن هــاورێو زۆرتریــن تەلــەفۆنی بــۆ دەکــراو هــەمووشمان ئێرەییمان بەرەوشتی بەرزی دەبرد؛ کە لە دەمێکەوە زانیبوومــان (رەوشــتی) پێــش ئەو تەمەنە لاوەی کەوتووەو رامابووین لە ســەلیقەو دڵســۆزییو ســنگی فــراوان و سادەو دڵی پڕ لە ئاشتیو ئەوین وراستگۆییو ماندوونەناسینی..کە لەگەڵ هــەموو ئەمانەشدا؛ هەموو رۆژێکیــش بەرنامەیــەکی تــازەی لــە خــەیاڵدا بــوو.. هــەموو رۆژێکیش رەنگی کــاری تــازەی دارشــت بــۆ ســازکردن و بەســتنی کــۆڕو دیــداری ئــەدەبیی، لەناوچــە جیاجیاکــانی کوردســتاندا، هــەر لــە دامێنــی لورســـتانەوە، تائەوپەڕی باکووری نیشتمانەکەیو ..لەهەموویشیاندا خەونی خستنە رێی کــاروانی ئەدەب و فەرهــەنگی نیشــتمانەکەی بــوو.. تالەســەنگەری فەرهەنگــەوە، بــەدیدو توانایەکی پۆلاییینەوە، هاوبەشی ئارایشتکردنەوەی فەرهەنگی نیشتمانەکەی بکــات

و بیسەلمێنێ کە ئەمیش ناسنامەیەکی مرۆڤانەی پێیەو بەتاسەو پەرۆشێکی بێپشووەوە، نیشتمانەکەی وێردی سەر زمانی رۆح و زمانی دڵ و زمانی مێشکی بوو..بەهەموو مانای واژەی عاشقەوە، عاشقی نیشتمانەکەی بوو.. خەونی دەدی: بۆ تەنیا ساتێکیش بێت، نیشتمانەکەی لەوپەری ئاسوودەییدا ببینێ:

هەور: کامێرا

برووسکە: فلاش

نم نمەی باران

بۆ شووشتنەوەو دڵی منیش: قاپ

ئا..ی نیشتمانم، هەتا یەك چرکە،

بۆ لێوەکانت بزە قەرزکە

(وێنە)

## پێڕست


١ - هەڵەبجە

ئەدەب و هونەرو سیاسەت

٢ - سوارە ئیلخانی‌زادە

رەفیق سابیر

٣ - دیوانی (کەمالی)

عەلی باپیرئاغای شاعیر

٤ - شیعرێک لە نێوان (نالی) وە (کوردی) دا

٥ - رەخنەی ئێمە و خۆزگەی من

٦ - مەولەوی ! یان گەڕانەوە بۆ سەرچاوە

٧ - نالی و مەستوورە

٨ - عەتا نەهایی

لە گێژەنی تەنگانەی سەردەمدا

٩ - مارف ئاغایی

شاعیری تەنیایی و ماڵئاوایی

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی 1996

١- رستە سازی و شیتەڵکاری زانستی .. د. شێرکۆ بابان
٢- سەعید زەبۆکی لای خۆمان ... ڕۆمان .. کەمال سەعدی
٣- البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك .. د. خليل اسماعيل محمد

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی 1997

١- کاولاش .. ڕۆمان .. عبدالله سەراج
٢- مەم و زین .. علی فتاح دزەیی
٣- پشکۆ و خۆڵەمێش .. ئازاد عبدالواحد
٤- دەردە کورد .. محمود زامدار
٥- باڵەبان .. وریا ئەحمەد
٦- چیرۆکی فۆلکلۆری .. محمد رشدی دزەیی
٧- کوردستانی خوارووی ڕۆژهەڵات .. د. ڕەشاد میران
٨- ووشەو زاراوەکانی باباتاهیر .. د. محمد نوری عارف
٩- حەمەدۆک .. یەشار کەمال
١٠- کورتیەک ژدیروکا اڤیانوسا .. د. بێوار خنسی
١١- ڕۆمانی درز .. کاکە مەم بۆتانی
١٢- میکانیزمە بنەڕەتیەکانی رستەسازی .. د. شێرکۆ بابان
١٣- أرض الاجداد.. شعر .. سرياني .. كوركيس يوسف
١٤- کورسی کورسی .. نەجات رەفیق حلمی
١٥- ئۆل و فەلسەفەیا زەردەشت .. میرال زیلانی
١٦- ئەفسانەی تۆفانی سۆمەری .. نجم خالد ئەلوەنی
١٧- دەروێشی عەبدی .. شاکر محمدامین ڕۆژبەیانی
١٨- مەولود نامەی کوردی .. محمد رشاد مفتی
١٩- کورد لە ئینسکلوپیدیای ئیسلام .. حمە کەریم عارف
٢٠- تاریکستانی لم .. صلاح عمر
٢١- ئازادی یا مەرگ .. کەریم حسامی
٢٢- ڤێربوونا لاتینی .. شەوکەت سندی
٢٣- هەولێرم وا دیومو بیستوە .. مەولود بێخاڵی
٢٤- وتەکانی ژیان .. محمد عبدالرحمان زەنگەنە
٢٥- پۆینە زێرینە .. هیمەت کاکەیی
٢٦- مەملەکەتی مسی... محمد فەریق حەسەن
٢٧- چیرۆکی هونەری کوردیی.. زاهیر ڕۆژبەیانی
٢٨- لاوک و سترانی کوردەواری.. یاسین حسن گۆران
٢٩-لاوک و سترانی ئەو دیوی قەفقاس.. یاسمین بەرزنجی
٣٠- دایکی کوردان .. حەمە کەریم هەورامی
٣١- هەو کردن بە ڤایروسی (HIV) و نەخۆشی ئەیدز .... د. زاهر سۆران

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی 1998


٣٢- شاکر فەتاحی شەهید... فەلەکەدین کاکەیی- مەحمود زامدار

٣٣-پێشکەوتن ... علی ناجی کاکە حەمە ئەمین- سیروان بەکر سامی

٣٤- رۆژنامەی (کوردستان)ی دایک... مەحمود زامدار

٣٥- گەشتێک لەنێو جیهانی بزاڤی رۆژنامەگەریی کوردی... مەحمود زامدار

٣٦- هەفتەنامەی گۆڤار... تاریق جامباز

٣٧-رۆڵی گۆڤاری هیوا لەپێشخستنی هونەری کوردی ... هیمداد حوسێن

٣٨- چەند بابەتێکی رۆژنامە نووسی.....حەمە سالح فەرهادی

٣٩- ئەستێرە... ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی

٤٠- رۆژنامەنووس و بواری رۆژنامەگەری .... رەسول بەختیار

٤١- رۆژناما کوردستان و شوەرشا رەوشەنبیری.... شەوکەت طاهر سندی

٤٢- رۆژنامەنووسی کوردی لە کوردستانی دوای -راپەڕین -.. عبدالله زەنگەنە

٤٣- حرب الكلمة ...... نزار جرجيس علي

٤٤- سەرکوتی رۆژنامەی کوردی لەسێبەری یاسادا.... غازی حسن

٤٥- کاریکاتێر... گرفتار کاکەیی

٤٦ - بیبلۆگرافیای هەفتەنامەی پەیمان....

٤٧ – بحث متكامل لايجاد طريقة لاختزال باللغة الكردية لاول مرة .... وشيار بشير مصطفى چلبي

٤٨- رۆژنامەگەری لەسەرەتای سەرهەڵدانەکانەوە تاچەرخی نوێکاری.. برایمی مەلا

٤٩- رەنگدانەوەی دۆزی ژن بە نێوی ژنەوە لە نێو رۆژنامەگەری کوردیدا......د.کوردستان موکریانی

٥٠- كامران شاعر من كردستان .... كامل حسن البصير

٥١- پایزی چاوەکان..... نژاد عزیز سورمێ

٥٢- کوردستان .... قادر وریا

٥٣-الحقيقه-راستی-........د. عبدالفتاح علی بوتانی (تعضید)

٥٤-چالاکیەکانی وەزارەتی رۆشنبیری ١٩٩٧.....محمد خدر مولود-عزیز هەریری

٥٥- بنەماڵانی بەناوبانگی رواندز..... مەمدوح مزوری

٥٦- البدرخانيون..... شكور مصطفى

٥٧- الكرد والحق ....... عزيز عبدالاحد نباتي

٥٨- زنزانة كفر.... سلام عبدالله

٥٩- سراج السالكين..... ترجمة محمد جميل روژبەیانی

٦٠- کۆمەڵایەتی لە کوردستاندا....... مامۆستا محەمەد مەلا قادر

٦١- هونەری دیپلۆماسیوکاری پەیوەندیەکان.... عەبدوڵلا ئاگرین

٦٢-پاشکۆی بیرەوەریەکانم.... ئەحمەد دلزار

٦٣-دراڤەک ژدەریا فلکلوری...عبدالعزیز خیاط - عبدالعزیز هاجانی

٦٤- دەمێ چوارگۆشە... سەلمان کوفلی

٦٥- یادەکانی ئادار.... محمد خدر مولود

٦٦- تابلۆکانی شەرەفنامە.. عبدلرقیب یوسف

٦٧- چالاکیەکانی وەزارەتی روشنبیریی ١٩٩٨ .... محمد خدر مەولود

٦٨- گولزاری منداڵان... کازم کۆیی

٦٩- داستان و گۆرانی لە فۆلکلۆری کوردی..... عمر شێخەڵلا دەشتەکی

٧٠- راو و شکار لە جیهاندا.. عبدالغفور ملا علی

٧١- راوە گزنگ .... محمد حەمە باقی